# فەرهەنگی زاراوەی ڕەخنەیی

## ئینگلیزی-کوردی-فارسی

له بلاوكراوه‌كانی ماڵی وه‌فایی
ناونیشان: هه‌ولێر ـ فولكه‌ی زه‌راعه ـ نێو پاركی وه‌فایی
https://www.facebook.com/mali.wafai
٠٧٥٠٤٨٢٦٦٤٧

# د. بەختیار سەجادی

پرۆفیسۆری هاوکار لە ئەدەبی ئینگلیزی، زانکۆی کوردستان، سنە، ئێران

---

- ناوی کتێب: فەرهەنگی زاراوەی ڕەخنەیی
- نووسەر: د. بەختیار سەجادی
- سەرپەرشتیاری چاپ: سۆران عەزیز
- نەخشەسازیی بەرگ: زاری
- پیتچنین: وریا دیوانی
- پێداچوونەوە: مەزهەر ئیبراهیمی
- چاپ: چاپی سێیەم، پێداچوونەی سێیەم/ ٢٠٢٢
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخی: ١٢٠٠٠دینار
- لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پەرتووکخانە گشتییەکان ژمارە ( ٦٧ )ـی ساڵی ٢٠٢٢ـی دراوەتێ.

# فەرهەنگی زاراوەی ڕەخنەیی

## ئینگلیزی-کوردی (ناوەندی و سەروو)-فارسی

چاپی سێیەم، پێداچوونەی سێیەم


## د. بەختیار سەجادی

**پرۆفیسۆری هاوکار لە ئەدەبی ئینگلیزی**

**ئەندامی توێژینگەی کوردستان‌ناسی**

**زانکۆی کوردستان، سنە**



**ماڵی وەفایی، ۲۰۲۲**

## پێشەکی



## پەنجا خاڵ

### لەسەر زاراوەسازی و وەرگێڕانی چەمکەکان

# پێشەکی

### وتەی دەستپێک

یەکێک لە گرفتە سەرەکییەکانی بەرهەمهێنان و وەرگێڕانی دەقی سەر بە لقە جیاجیا زانستییەکان بۆ توێژەر و وەرگێڕی کوردینووس بریتییە لە چۆنیەتیی بەکارهێنان و وەرگێڕانی زاراوە و چەمکە زانستی و تیۆرییەکان. ئەم گرفتە لەو زمانانەی نزیکایەتییان لەگەڵ لاتیندا هەیە و ئەو زمانانەی پاش نەمانی لاتین گەشەیان کرد کەمتر وەبەرچاو دەکەوێ. گرنگایەتیی چەمک و زاراوە پسپۆڕانەکان گەیشتۆتە ئەو ئاستەی تەنانەت لەو زمانانەشدا کە لە ژێر کاریگەریی لاتینداان بەشێک لەو زاراوانەی ڕەگیان لە لاتیندایە بوونەتە خاوەنی پێناسەی جیاواز. بۆیەش لە سەرەتای لێکۆڵینەوەگەلی ئەکادێمیکدا – بە هەر زمانێک بێت – توێژەر پێویستە ئاماژە بۆ پێناسە و واتا جیاجیاکانی ئەو چەمکانە بکات کە لەو لێکۆڵینەوەیەدا دەوری سەرەکییان هەیە لە بەرەوپێشبردنی باسەکەدا. لە کوردیدا، سەرەڕای چەندین هەوڵی بەنرخی تاکەکەسی و تەنانەت دامەزراوەییش، گرفتی زاراوەسازی و وشەڕۆنان هێشتا هەر لە گۆڕێدایە و چارەسەر نەبووە. ئەم گرفتە تا ڕادەیەک لە زمانی فارسیدا چارەسەرکراوە و لە هەندێ زمانی تردا وەک عەرەبی بە شێوەی کەمتاکورت هەر ماوەتەوە. لە زمانی کوردیدا، بەڵام، بێجگە لە پێویستیی سەرنجدان بە پێناسەی جیاجیای چەمکەکان بە گوێرەی لق و ڕێبازە جیاوازەکان، ئەمە خودی داهێنان یان وەرگێڕانی ئەو چەمکانەیە کە وەک گرفتێکی سەرەکی لە بەردەم توێژەردا قوت دەبێتەوە.

زاراوەسازی، وشەڕۆنان و هاوواتادانان بۆ چەمکە زانستی و تیۆریکەکان، پێوەندیی ڕاستەوخۆیان هەیە لەگەڵ بابەتی پەرەسەندنی زماندا. هەندێ هۆکاری دابینکەری ئاستی گەشەسەندوویی زمان لە یەکەم هەنگاودا دەگەڕێتەوە بۆ تایبەتمەندی و توانستی ئەو زمانە لە ڕووی بەرهەمهێنانی زاراوەگەلی نوێوە. بەختەوەرانە زمانی کوردی خاوەنی بەشێکی زۆری ئەو مۆرکانەیە و لەم ڕووەوە بە زمانێکی دەوڵەمەند دادەنرێت، بەڵام ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئێمەی کورد خاوەنی قامووسێکی گشتگیر سەبارەت بە زاراوەگەلی زانستە مرۆییەکان نین کە لە لایەن بەشێکی زۆری توێژەرانی کوردی‌نووسەوە وەک پێوەر بەکار بهێنرێت. ئەوڕۆکە یەکێک لە مژارە هەرە جیدییە پێوەندیدارەکان بە زمانی کوردییەوە بریتییە لە پرسی زێدە گرنگی زاراوەسازی و وشەڕۆنان. «زاراوەناسی» لێرەدا وەک هاوواتای تێرمینۆلۆجی (terminology) بەکار هێنراوە، کەچی وەک دەزانرێ، دەشکرێ بە مانای دیالێکتۆلۆجی (dialectology) دابنرێ، کە دیارە لێرە ئیدی مەبەستمان «زارناسی» (گویش‌شناسی) نییە. لە کوردیی ناوەندیدا، «زاراوە» هاوکات بۆ term و dialect بەکار ئەهێنرێ؛ لە کوردیی سەرووشدا بۆ زاراوە و چەمک بە مانای term و concept کەڵک لە têgeh وەردەگیردرێت. هەر لەبەر ئەم هاوشێوەییە زاراوەناسانەیەش، پێشنیاز کراوە لە بری دیالێکتۆلۆجی «زارناسی» بەکار بهێندرێت.

زاراوەسازی بۆ چەمکەکانی زانستە مرۆییەکان جیاوازیی زۆری لەگەڵ وشەڕۆناندا هەیە و تەنانەت ناشبێ لەگەڵ هاوواتادانان بۆ زاراوە پیشەیی و زانستییە تایبەتەکاندا بە یەکێک دابنرێت. وشەڕۆنان ڕواڵەتێکی گشتی و گشتگیر و جەماوەریی هەیە و زاراوەسازی تا ڕادەیەک پسپۆڕانە و سنووردارترە و تایبەتە بە لقە جیاجیاکانی زانستە مرۆیی و ئەزموونی و پزیشکییەکان؛ دیارە زاراوەسازیی زانستی بواری گشتگیربوون و چوونە نێو خەڵکیشی هەیە. زاراوە پیشەیی و زانستییە تایبەتەکان، بە پێچەوانەی وشەڕۆنانەوە، هەر تەنیا لە لقێکی دیاریکراوی زانستدا و بە شێوەیەکی شاز و پسپۆڕانە دێنە بەکارهێنان و لە شوێنەکانی تردا مانای خۆیان دەدۆڕێنن، یان لەوانەشە بێجگە لە مەبەستی تایبەتی خۆیان هیچ مانایەکی دیکە بەدەستەوە نەدەن. بۆ ڕوون-کردنەوەی ئەم بابەتە نموونەیەک لە زاراوەناسیی دەقەری لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و ڕەخنەیی دەهێنمەوە. زاراوەناسیی ئەدەبی بە سەر سێ بەشی گشتیدا دابەش دەکرێت کە بریتین لە: ١) زاراوە ئەدەبییەکان (literary terms) کە دوو بەشی گەورەی هونەرگەلی گوتەیی (figures of speech) و هونەرگەلی واتایی (figures of thought) دەگرنەوە؛ ٢) زاراوە ڕەخنەییەکان (critical terms) کە بریتین لەو چەمک و زاراوە پسپۆڕانەگەلەی لە سەر دەستی ڕەخنەگر و

بیرداڕێژانی ئەدەبییەوە هاتوونەتە نێو زمانەوە و بەشێک لە چوارچێوەی مەعریفیی سیستەمی ڕەخنەکاریی بەرباس پێکدەهێنن؛ ٣) زاراوە تیۆریکەکان (theoretical terms) کە پتر هەندێ چەمکی دەرهەست و تیۆریکن و بە لێشاو لە دەقە تیۆریک و فەلسەفییەکاندا دەردەکەون. زاراوەکانی هەر سێ گروپەکە لە دەرەوەی بازنەی خۆیان خاوەنی فرەپاتییەکی کەمن و هەر چەشنە هەوڵێک بۆ هاوواتاسازییان دەچێتە خانەی زاراوەسازییەوە و مەرج نییە وەک وشەڕۆنان سەیر بکرێن؛ هەر بۆیەش لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بۆ خوێنەر و بیسەری ئاسایی نامۆ دەنوێنن. بە پێچەوانەوە، وشەڕۆنان ڕواڵەتێکی گشتیتری هەیە. ئێمەی کورد نەک هەر لە زاراوەسازیی پسپۆڕانەدا بەڵکوو تەنانەت لە وشەڕۆنانی گشتیشدا بەو شێوەیەی پێویستە کارمان نەکردووە، ئەمەش لە کاتێکدایە پرسەکە وەک پێویستییەکی حاشاهەڵنەگر خۆی دەرخستووە.

## کورتەمێژووی زاراوەسازی لە زمانی کوردیدا

یەکەم هەنگاوەکان بۆ زاراوەسازی لە کوردیی ناوەندی و سەروودا لە ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکانی دەستپێکی سەدەی بیستەمدا هەڵگیران. گەرچی پێشتر لە بەرهەمی شاعیرانی کلاسیکی کوردیی ناوەڕاست و کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا هەوڵی داهێنانی وشە و لێکدراوی نوێ وەبەرچاو دەکەوێ، بەڵام ئەو نموونانە دەچنە خانەی داهێنانی ئەدەبییەوە. هەوڵەکان بۆ زاراوەسازی لە کوردیی ناوەندیدا لە دەستپێکی سەدەی بیستەمەوە تا ئێستا و بەبێ پچڕان بەردەوامن، بەڵام ڕەوتەکە لە کوردیی سەروودا، سەرەڕای بووژانەوەی سەرنجڕاکێشی زمان و وێژە و ڕۆژنامەڤانی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا و نەخاسما لە ئیستانبۆڵ، بەداخەوە ماوەیەکی کەم پاش کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی دامرکا. لە کوردستانی باکوور و ڕۆژئاوادا بە هۆی هەندێ هۆکاری دیار و لەوانە سانسۆری توندی سەر هەر جۆرە بەکارهێنانێکی زمانی کوردی و هەر چەشنە هەنگاوێک لە پێناوی زمانی کوردیدا بۆ ماوەی لانی کەم نیو سەدە، هەوڵەکان لەم دەڤەرەدا بە ناتەواوی و نیوەچڵی مانەوە. هەوڵەکان بە مەبەستی زاراوەسازی لە کورمانجیدا لە دەرەوەی کوردستان و لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا لەسەر دەستی ڕۆشنبیرانی کورد وەک بەدرخانەکان و مامۆستایانی کوردیNووسی دانیشتووی یەکێتیی سۆڤیەت هەر بەردەوام بوو، بەڵام هەنگاوی پتەوتر لەم ڕووەوە لە لایەن نووسەران و توێژەرانی باکووری کوردستانەوە لە هەشتاکان و بە تایبەت نەوەدەکانی سەدەی بیستەمدا هەڵگیران. دواتر لە

دستپێکی سەدەی بیستویەک و هاوکات لەگەڵ گەشەی ئینتێرنێتدا ئەو ڕەوتە گیانێکی تازەی گرتە خۆی و ئێستاش هەر بەردەوامە. نووسەران و توێژەرانی کورمانجی‌نووس بۆ هاوواتای کوردیی هەندێ وشە و زاراوە و دەستەواژە کەڵک لەو هاوواتاگەلە وەردەگرن کە لە ناو کوردیی ناوەندیدا مسۆگەر بوونە؛ بە پێچەوانەشەوە، توێژەر و وەرگێڕی کوردیی ناوەندی زۆر جار ئەو هاوواتایەنە بەکار ئەهێنن کە لە کورمانجیدا سەقامیان گرتووە.

ڕەوتی زاراوەسازی لە کوردیی ناوەندیدا بە بەراورد لەگەڵ کوردیی سەروو بەهێزتر و بەرفراوانترە و خاوەنی پاشخانێکی دەوڵەمەندترە. هاوکات لەگەڵ وەستانی ڕەوتی زاراوەسازیی کوردیی سەروو لە قۆناغە جیاجیاکانی سەدەی بیستەمدا، هەوڵەکان لەم پێناوەدا لە کوردیی ناوەندیدا درێژەیان هەبووە. ڕۆژنامەنووسان، نووسەران و توێژەران و تەنانەت شاعیرانی باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە دووتوێی لاپەڕەکانی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا هەندێ هەوڵی ناوازەیان لەم بەستێنەدا بە ئەنجام گەیاند. یەکەم ناوی درەوشاوە لەم ڕووەوە حسێن حوزنی موکریانی بوو کە یەکەمین چاپخانەش لە کوردستانی باشوور هەر ئەو دایمەزراند. وشەی «مێژوو» ڕۆنراوەی ئەوە و بۆ کۆمەڵێ زاراوەی نوێی دیکەش پێشنیازی پێشکەش کردووە. بۆ نموونە، ئەوەی ئەمڕۆ ئێمە بە «ڕۆژهەڵاتناس» دەیناسین لە سەر دەستی ئەو بە شێوەی «ڕۆژهەڵاتیەوان» بەکارهاتووە. بەم چەشنە گوڕ و تینی زیاتر بەخشرایە ڕەوتەکە و بەردەوام بوو. ڕەفیق حیلمی، تۆفیق وەهبی، شێخ نووری و گۆران بە هۆی پێشکەشکردنی ئەو نووسینانەی دەچوونە خانەی نائەدەبییەوە و زیاتر لە ڕواڵەتی پەخشان و وتاری زانستیدا ئاراستە دەکران دەوری گرنگیان گێڕا لە گەشەی زاراوەسازی لە کوردیی ناوەندیدا. وشەی «شانۆ» لە لایەن گۆران-ەوە داهێنرا و ئەمەش دەرخەری ئەو خوازیاری و داگەڕانە بوو کە لە ناو توێژی ڕووناکبیری ئەو سەردەمە بۆ خەملاندنی زمانی کوردی لە سەردەمی مۆدێرندا هاتبووە ئاراوە. جەمال نەبەز لە ۱۹٦۰دا *هەندێک زاراوەی زانستی*-ی بە کوردی و عەرەبی بڵاوکردەوە. هەر لەو ساڵەدا لقی نەقابەی مامۆستایان لە سلێمانی کتێبێکی بڵاوکردەوە بە ناوی *زاراوەی زانستیی کوردی*. چاپبوونی فەرهەنگی پێنجزمانیی *کوڵکە زێڕینە* لە لایەن گیو موکریانی-یەوە بە کوردی، فارسی، عەرەبی، فەرەنسی و ئینگلیزی لە ساڵی ۱۹٦٦دا خێرایی و گرنگایەتیی زیاتری بەخشی بە ڕەوتەکە.

زاراوەسازی لە زمانی کوردیدا، وەک بەو نموونانەی سەرەوەدا دیارە، سەرەتا لە دوو بواری زمانناسی و ئەدەبدا گەشەی بەرچاوی بە خۆیەوە بینی. ژمارەی فەرهەنگەکانی پێوەندیدار بە

لایەنە جیاجیاکانی زمانناسییەوە لە حەفتاکاندا و لە باشوور بە شێوەیەکی بەرچاو گەشەی کرد. هۆکارەکەش بۆ چالاکیی بەشەکانی زمانی کوردی لە زانکۆکان و کۆڕی زانیاری کورد و هەروەهاش بۆ پێوەندیی نێوان ئەم ناوەندانە لەگەڵ ئەنستیتۆتی زانستە ڕۆژهەڵاتییەکان لە سۆڤیەت و بە تایبەت لە سەینت پیتێرزبورگ دەگەڕایەوە. هەر تەنها لە بواری بوێژ و دەربڕینە زمانییەکاندا چەندین فەرهەنگی ئیدیۆم و زاراوە بە زارە جیاجیاکان و بە عەرەبی و ڕووسیش لە چاپ دران. لە بەشی ئەدەبیشدا، عەلائەدین سەجادی لە کۆتایی حەفتاکاندا کۆمەڵێ زاراوەی بۆ یەکەم جار لە کتێبی *خۆشخوانی*دا وەک هاوواتای هونەرە ئەدەبییەکانی وێژەی فارسی و عەرەبی بەکارهێنا. گەر چاوێک بە پێشەکیی کتێبی ناوبراودا بخشێنین، تێدەگەیین باسوخواسی داهێنانی وشە و زاراوەی نوێ لەو سەردەمەشدا ڕەخنەی زۆری لێ گیراوە. ئەمەش ئا تەو ئاستە سەجادی ناچارە بۆ ڕۆنانی خودی زاراوەی خۆشخوانی کۆمەڵێ بەڵگە و هۆ بهێنێتەوە و لە کۆتاییشدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات ئەم ڕەوتە لە هەموو زمانێکدا هەیە و نابێ ببێتە هۆی ڕەخنە و ڕەخنەکاری.

ڕەوتی وشەڕۆنان و زاراوەسازی لە ڕۆژهەڵاتی چارەکی یەکەمی سەدەی بیستدا، بە هۆی کەمبوونی ژمارەی چاپەمەنییە کوردییەکان بە بەراورد لەگەڵ ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییانەی لە بەغداد و سلێمانی دەردەچوون، کز و لاواز بوو. بەڵام، لە بڵاوکراوەکانی سەردەمی کۆماردا ئەم بابەتە بە شێوەیەکی شیاو بووژایەوە و کۆمەڵێ وشە و زاراوەی نوێ بە سەرنجدان بە مۆرکی ڕەسەنایەتیی زمانی کوردی ناسێندران و هەندێکیشیان داهێنران. تەمەنی کورتی کۆمار کە تا بەر لە ڕووخانی بووبووە هۆی گەشانەوەی زمان و وێژە و هونەر لەو قۆناغەدا هۆکار بوو بۆ وەستانی ئەو ڕەوتە لە ڕۆژهەڵات بۆ ماوەی چەندین ساڵ.

تەشقی کارەکان لە ئاقاری زاراوەسازیدا دەگەڕێتەوە بۆ دامەزراندنی کۆڕی زانیاریی کورد لە بەغداد، لە سەرەتای حەفتاکاندا. دامەزراندنی بەشی کوردی لە زانکۆی بەغداد چەند ساڵێک بەر لە دامەزراندنی کۆڕ بەستێنی بۆ ئەو ڕەوتە خۆش کردبوو. هەندێ مامۆستای شارەزا و خەمخۆری زمانی کوردی وەک مەلا عەبدولکەریم مودەڕس، حەمەی مەلا کەریم، مەسعوود محەمەد و ئەو ئەندامانەی کۆڕ کە پسپۆڕییان زمان و زمانەوانی بوو، دەستیان کرد بە ڕۆنان و دانانی وشە و زاراوەی نوێ. دواتر، زاراوەسازی لە بەکوردیکردنی کتێبەکانی قوتابخانەکانی سیستەمی پەروەردە وەک پێویستییەک خۆی دەرخست و هەندێ مامۆستای دڵسۆزی وەک شوکور مستەفا، کامیل حەسەن بەسیر و ئەندامانی دیکەی لێژنەکە دەستی

بالآیان هەبوو لە دانانی زاراوەکان؛ ئەمە یەکەم قۆناغی هەستکردن بە پێویستیی حاشاهەڵنەگری زاراوەسازی بوو. لە پاڵ ئەمانەشدا، لە چەند ژمارەیەکی گۆڤاری زانکۆی سلێمانی لە ناوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی پێشوودا هەندێ هەوڵی باش لەم ڕووەوە ئەنجام دران. گەرچی لە حەفتاکان و هەشتاکاندا فەرهەنگی جیاجیای ئەدەبی و زمانناسانە و زانست، پتر عەرەبی-کوردی و عەرەبی-ئینگلیزی-کوردی، لە چاپ دەدران، بەڵام لە دوای ڕاپەڕینەوە دەیان فەرهەنگی جیاواز لە بوارە جیاجیاکاندا وەک دەروونناسی، کۆمەڵناسی، ئابووری، جوگرافی، بیرکاری، و زیندەوەرناسی، پزیشکی، ڕاگەیاندن و تەنانەت ئەستێرەزانی کەوتنە بەر دەستی خوێنەران.

پاش ڕاپەڕین ڕەوتی زاراوەسازی گوڕ و تینێکی تازەتری گرتە خۆی. لەم قۆناغەدا کاروباری دیوانیی حوکمڕانیی کوردی پێویستی بە هاوواتای کوردیی زاراوە جیاجیاکان بوو و بە هیچ شێوەیەک نەدەکرا پشتگوێ بخرێ. تا کەنگێ وشە و زاراوەی عەرەبی لە ناو دوو کەوانەدا لە نامەی ئیداریدا خۆی بنوێنێ؟ بەڵام سەرەڕای ئەم پێویستییەش دیسانەوە هەوڵی جیدی و دامەزراوەیی بۆ ئەم کارە نەدرا و هەنگاوەکان زیاتر تاکەکەسی بوون. بڕیاری دانانی کۆڕی زانیاریی کوردستان لە لایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە لە هەولێر لە ساڵی ١٩٩٨دا — کە لە ڕاستیدا لە کۆتاییی ٢٠٠١دا بە شێوەی دامەزراوەیی دەستی بە کار کرد و دواتر لە ٢٠٠٨دا ناوەکەی بۆ ئەکادێمیای کوردی گۆڕدرا — مزگێنیبەخشی ئەنجامدانی کاری گەورە بوو لەم بوارەدا. شوکور مستەفا لە ژمارەی یەکەمی گۆڤاری *ئەکادیمی*دا وتارێکی تێروتەسەلی بە ناوی «ئەکادێمیا، فەرهەنگستان، زاراوەڕۆنان» نووسی و بە وردی باسی لەسەر مێژوو، لقەکان، پێویستی و بایەخی زێدە گرنگی «زاراوەسازی»، «زاراوەدانان» و «زاراوەڕانان» کرد و هاوکات ئاماژەشی بۆ کۆمەڵێ ڕێسای گرنگی بوارەکە کرد، بە تایبەت لە زمانی کوردیدا. شوکور مستەفا لەو وتارەدا باس لەوە دەکات کە هەر دە لیژنەکەی کۆڕی زانیاریی کورد لە بەغداد «بایەخیان بە زاراوەدانان دەدا» (٢٠٠٢: ١٣١). سەبارەت بە کارەکانی کۆڕی زانیاریی کوردستانیش گەرچی باسی پێنج لیژنەی سەرەکیی ئەو کۆڕە دەکات بەڵام هاوکات ئاماژەش بۆ ئەوە دەکات کە «١٤-١٥ لیژنە بۆ بە زاراوەکانی کتێبە فێرگەییەکاندا چوونەوە، داندراون و لە کاتی دیاریکراوی خۆیاندا ئەو کارە ئەنجام دراوە» (١٣٤). جێگای سەرنجە کە پاش بیست ساڵ لە دەرچوونی ئەو نووسینە بەپێزە هێشتا لیژنە تایبەتمەندەکانی کۆڕ بۆ زاراوەسازی دانەمەزراون و یاخود چالاک نین و ئەو جۆرەی چاوەڕوان دەکرا کارەکە سەری نەگرت. گەر ئاوڕێک لە وتارە بڵاوکراوەکانی نزیکەی پەنجا ژمارەی گۆڤاری ئەکادێمیای کوردی لە بیست

ساڵی ڕابردوودا بدەینەوە، تێدەگەیین زۆربەی توێژینەوەکان تەرخان کراون بۆ مێژوو، فۆلکلۆر، شیعری کلاسیک، ناساندنی داهێنەرە ئەدەبییەکان، ڕۆژنامەگەری، ڕێزمان، زارناسی و خوێندنەوەی بەرهەمە ئەدەبییەکان. لەم گۆڤارەدا جێگای چۆڵی بابەتە پێوەندیدارەکان بە یاسا و ڕێساگەلی بواری وشەڕۆنان و زاراوەسازییەوە — کە ئەرکیشی دەبێ هەر ئەوە بێت، ئەگینا ئەو بابەتانەی سەرەوە لە گۆڤارە زانکۆییەکانیشدا بڵاودەکرێنەوە — بە زەقی دیارە.

لە بیست ساڵی ڕابردوودا، چ لە لایەن ئەکادێمیای کوردی و چ لە لایەن کەس و ناوەندەکانی ترەوە لە باشوور و ڕۆژهەڵات، کۆمەڵێ فەرهەنگی زاراوەی جیاجیا سەبارەت بە یاسا، ئابووری، کارگێڕی، ژمێریاری، بیرکاری، پزیشکی و هتد بڵاوکرانەوە. پێویستییەکانی خوێندن لە قوتابخانە و زانکۆکاندا و سەرهەڵدانی چەندین گۆڤار لەسەر لقە زانستییەکان ڕەوتەکەی گەشاندەوە. هاوکات دامەزراندنی دەیان کاناڵی تەلەڤیزیۆنی لە لایەکەوە و نامەکاری و کاروباری ئیداری کە تێکڕا بە کوردی بوون، لە لایەکی ترەوە، پێویستیی وشەڕۆنان و زاراوەسازییان زیاتر لە جاران بەرجەستە کردەوە. لە پاڵ ئەمانەشدا لە ناوەندەکانی بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندندا کۆمەڵێ کاری گرنگ لەم ڕووەوە ئەنجام دران؛ وەک دەزگای سەردەم لە سلێمانی کە گۆڤاری *زانستی سەردەم*ـی بڵاوکردەوە و هەوڵەکانی کۆچکردوو ئەکرەم قەرەداغی لەم بوارەدا جێگای بیرهێنانەوە و پێزانینە.

یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی گرنگیی‌نەدانی نووسەرانی کورد بە بابەتی زێدە هەستیاری زاراوەسازی ئەوەیە کە زۆرینەی ئەو کەسانە، تەنها لە ناو زمان و ئەدەب و نووسینی کوردی یان زمانەکانی دراوسێدا کار دەکەن و کەمتر ئاگاداری ئەو زمانانەن کە بوونەتە بەرهەمهێنی زاراوەی زانستی و تەکنیکی. گەر دەشیزانن، ئەوا لە بواری مێژوویی یان ڕۆژنامەوانی و سیاسەتدا دەشوغڵێن و کەمتر ئاوڕ لە ڕەوتی پەرەسەندنی بەشە زانستییەکانی تر دەدەنەوە و یاخود لەگەڵ دەقی ئەو بوارانەدا بە شێوەی ڕاستەوخۆ ڕووبەڕوو نابنەوە و لەگەڵیان زۆرانبازی ناکەن. بە دیاریکراوی مەبەستم ئەوەیە بەشێکی زۆری نووسەرانی کورد ئاگاداری ڕێبازە تازەکانی ڕەخنە و تیۆریی ئەدەبی و فەرهەنگی نین و گەر لەو دەڤەرەشدا کار دەکەن سەرچاوەکانیان بە عەرەبی و فارسی و تورکین، کە ئەوانیش بۆخۆیان لە ئینگلیزی و فەرەنسی و زمانی ترەوە وەرگێڕدراون. کاریگەریی زۆری دوو نەریتی سۆڤیەتی و عەرەبی لە باسوخواسەکان سەبارەت بە لێکۆڵینەوەی زمانی و ئەدەبی لە باشووری کوردستان هۆکارێکی تری بایەخنەدانە بەم پرسە. فۆرماڵیزم یەکەمین ڕێبازی ڕەخنەیی مۆدێرن بوو لە ڕەخنەی ئەدەبیدا کە لە مۆسکۆ

و سەینت پیتێرزبورگ سەری هەڵدا کەچی سەرجەم ئەو مامۆستا و خوێندکارە کورد و غەیرە کوردانەی لە سۆڤیەتی پێشوودا بە توێژینەوەی زمانی و ئەدەبییەوە سەرقاڵ بوون، باسیان نەدەکرد. لە وڵاتانی عەرەبیشدا هەوڵەکان لەم ئاقارەدا، بە پێچەوانەی زمانی فارسی، پەرەیان نەسەندووە.

سەرجەم ئەو هۆکارانەی سەرەوە وای کرد زۆربەی توێژەران و نووسەران لە سەرەتاوە کە چاویان بە بەرهەمێکی لەم چەشنە دەکەوت بە تیز و توانجەوە قسەیان لەسەر دەکرد. بەڵام تێپەڕبوونی ساڵەکان و قوتبوونەوەی پێداویستییەکانی ژیانی ئەمڕۆ وای کرد تەنانەت ئەوانەش کە ڕۆژگارێک بە توانجەوە باسیان لە زاراوەسازی دەکرد، بگەنە ئەو قەناعەتەی کە ئەمە پێویستییەکی حاشاهەڵنەگرە و هەر بۆیەش ئێستا بۆخۆیان بوونەتە لایەنگری بابەتەکە. خاڵی گرنگ لێرەدا ئەوەیە ناوەند و دەزگا و گۆڤارە پێوەندیدارەکان لە هەموو بەشەکانی کوردستان، تەنانەت ئێستاش، بە شێوەیەکی جیدی ڕووبەڕووی ئەم پرسە نابنەوە.

لە کوردستانی ئێراندا، پاش ئەو هەوڵە بەنرخانەی سەردەمی کۆمار، دیسانەوە وەک ئەوەی لە باکووری پاش شەڕی یەکەمی جیهانی ڕووی دا، ڕەوتەکە تووشی نسکۆ بووەوە. بێجگە لە چەند هەوڵێکی تاکەکەسی و ژمارەیەکی کەمی بڵاوکراوە و وێستگەی ڕادیۆیی لە پەنجاکان بۆ حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا، هەنگاوێکی ئەوتۆ لەم ڕووەوە تا شۆڕشی ١٩٧٩ نابیندرێ. هەوڵەکان لەم بوارەدا لە کوردستانی ئێراندا زیاتر تاکەکەسی بوون و یاخود لە شێوەی گرووپی بچووکی چەندکەسیدا بە ئەنجام دەگەیشتن. دامەزراندنی ناوەندی سەلاحەدین ئەیووبی لە ورمێ و دەرکردنی گۆڤاری *سروە* و چەند ساڵ دواتر دەرچوونی گۆڤاری *ئاوێنە* لە تاران، ڕواڵەتێکی نیمچەدامەزراوەیی بە ڕەوتی زاراوەسازی بەخشی. ئەو گۆڤارانە گەرچی لە زۆر لایەنەوە خزمەتی بەرچاویان بە زمان و وێژەی کوردی کرد، بەڵام لەم ڕووەوە بە بێهێزییەوە دەرکەوتن و مرۆڤ دەکارێ بێژێ ئەو دوو گۆڤارە، وەک تاقە مەکۆی قایمی زمانی کوردی بۆ نزیکەی بیست ساڵ لە ڕۆژهەڵات، زۆر بە هەڵکەوت و بە ناڕوونی و بە کەمتەرخەمییەوە ئاوڕیان لە پرسی وشەڕۆنان و زاراوەسازی دایەوە.

لە ڕۆژهەڵاتی کۆتایی سەدەی بیستەمدا ئەم پرسە زیاتر گرنگیی پێدرا و یەکێک لە هۆکارەکانی بریتی بوو لە نزیکیی لە زمانی فارسی و ئاگاداربوون لەو هەوڵانەی بە مەبەستی پەرەپێدانی زیاتری زمانی فارسی لەم چەند دەیەی ڕابردوودا دراوە، چ لە سێ قۆناغی گەورەی فەرهەنگستانی زمانی فارسیدا و چ لەو شەپۆلە بەرفراوانەی بڵاوکردنەوەی چاپەمەنییەکان لە بوارە زانستی و تیۆرییەکان بە زمانی فارسی. لە ڕۆژهەڵاتی دەستپێکی سەدەی بیست و یەکدا

دەیان نووسەر و وەرگێڕ و توێژەری شاەرەزا و بەبەهرە دەستیان کرد بە دانان و وەگێڕانی دەقی جیاجیای سەر بە زانستە مرۆییەکان و بۆ یەکەم جار لە ڕۆژهەڵاتدا بووژانەوەیەکی بەرچاو لەم ڕووەو هاتە ئاراوە. یەکەم هەوڵی پێوەندیدار لەم پێناوەدا لە ئێران بە شێوەیەکی نیمچەدامەزراوەیی بۆ دانانی کۆڕی زانستیی زمانی کوردی لە ساڵی ١٣٨١ (٢٠٠٢) دەگەڕێتەوە. پازدە ئەندامی ئەم کۆڕە لە هەڵبژاردنێکی ئازاددا و بە ئامادەبوونی زیاتر لە دووسەد نووسەر و وەرگێڕ و توێژەری کوردی‌نووسی ناوچە کوردنشینەکانی ئێران لە ڕێککەوتی دە و یازدەی جۆزەردانی ١٣٨١دا لە تاران دیاری‌کران. یەکێک لە هەنگاوە سەرەتاییەکانی کۆڕی زانستیی زمانی کوردی بریتی بوو لە دانانی لێژنەی زاراوەسازی و وشەڕۆنان. لە کۆنووسی یەکەم دانیشتنی کۆڕدا کە واژۆی هەموو ئەندامانی ئامادەی دانیشتنەکەی لە سەر بوو، ئەندامانی ئەو لێژنەیە ڕاگەیێندرا. لە یەکەمین ژمارەی گۆڤاری *زمانەوان*دا کە هەر ئەو ساڵە دەرچوو، وتارێکم لەسەر پێویستیی دانانی لێژنەیەک بۆ هەر دوو مەبەستی فێرکاری و پەرەپێدانی زمانی کوردی نووسی و لە ژمارەی سێیەمی هەمان گۆڤاردا وتارێکی ترم لەسەر وەرگێڕانی زاراوە و چەمکە زانستییەکان بڵاوکردەوە. چالاکییەکانی ئەو کۆڕە گەرچی هەمووی سێ ساڵی خایاند، بەڵام هەر لەو ماوە کورتەدا توانرا هەندێ هەنگاوی باش لەو ڕووەوە هەڵبگیردرێ. ئێمە لە چوار ژمارەی گۆڤاری *زمانەوان*دا درێژەمان بەم باسە دا. پاشان، لێژنە بڕیاری دا بەرێز کامران ڕەحیمی ڕابسپێردرێ بۆ دانانی کتێبێک سەبارەت بە بنەماکانی وشەڕۆنان و زاراوەسازی. ئەم کتێبە لە لایەن ئەندامانی کۆڕەوە، لەوانە مامۆستایان ئەحمەد قازی، عەتا نەهایی، یووسف ڕەسووڵ‌ئابادی، مەنسوور تەیفووری، کافی عەلەوی، ڕەزا شەجیعی و نووسەری ئەم دێڕانەوە پێداچوونەوەی وردی بۆ کرا و پاشان بڵاوکرایەوە.

دوای ئەوەی کار و چالاکیی کۆڕ بە هۆی کێشەی یاسایی و ئیدارییەوە ڕووی لە داکشان کرد، ئەندامانی ئەو لێژنەیە لە دەرەوەی کۆڕ درێژەیان بەو ڕەوتە دا و هەر کەسە و بە جیا لە بەرهەمەکانیدا — بە تایبەت لە وەرگێڕاندا —درێژەی بەم ئەرکە دەدا. هەوڵەکانی مەنسوور تەیفووری لەم ڕووەوە بووە جێگای سەرنجی هەموان و توانی گەلێک پێشنیازی تۆکمە ئاراستە بکات. لە ساڵانی دواتردا ڕەهبەر مەحموودزادە، مەسعوود بابایی و بەم دواییانەش ئازاد حاجی‌ئاقایی چەندین کتێبیان بڵاوکردەوە و وەک دانەری هەرە بەهرەداری بواری زاراوەسازی دەرکەوتن. کەسانی تریش لەم ڕووەوە کاری باشیان ئەنجام دا، بەڵام نووسینەکانیان کەمتر وەک کتێب پێشکەش کراون. لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا چەندین فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی و

فەلسەفی و یاخود زانستە مرۆییەکانی تر لە چاپ دراون. هەرچەند ئەم بەرهەمانە توانیویانە تا ڕادەیەک سوودبەخش بن لە ناساندنی ئەو زاراوە و چەمکانە و تەنانەت هەندێ لە زاراوە داهێنراوەکانی ژمارەیەک لەو فەرهەنگانەش لە زمانی کوردیدا جێگیر بوونە، بەڵام پێویستە ئاماژەش بەوە بکرێ کە هەندێ لەم فەرهەنگانە هاوکات هەڵگری چەندین هەڵەی زەقوزۆپیشن، بە تایبەت لە ڕووی ڕۆنانی هەندێ چەمک و زاراوەی بەکارهێنراوەوە، بە شێوەیەک کە دانەری ئەو فەرهەنگانە نەیانتوانیوە مانا و هاوواتایەکی دروست و پڕبەپێست بۆ هەندێکیان دابنێن. لە بیست ساڵی ڕابردوودا و بە هۆی پەرەسەندنی ئینتێرنێت و کەشی مەجازییەوە چەندین لاپەڕە و گروپ لە تۆڕ و ڕایەڵە کۆمەڵایەتییەکان سەبارەت بەم پرسە وە گەڕ کەوتوونە و نووسەران و توێژەران بە شێوەی تاک‌وتەرا و جیا لە کەسانی تر خەریکی داتاشینی زاراوەن و بۆیەش زۆربەی کات هەوڵەکانیان ناتوانێ ڕواڵەتێکی گشتی و گشتگیر لەخۆ بگرێ.

## پاشخان و گەشەکردنی ئەم فەرهەنگەی بەردەست

یەکەم گەرای ئەم فەرهەنگە لەو چەمک و زاراوانە پێکهات کە لە کتێب و نامیلکەکانی قۆناغی کارناسیی زمان و ئەدەبی ئینگلیزیدا لەگەڵیان ئاشنا بووم. هەر ئەو کاتە دەستم کرد بە کۆکردنەوەیان و دانانی هاوواتای فارسی و کوردی بۆیان. لە ١٣٧٥دا (١٩٩٦)، پرۆفێسۆر جەلال سوخەنوەر، مامۆستای بەشەکەی ئێمە، کتێبێکی ڕامان سێلدێن-ی بە ناوی *تیۆری ئەدەبی و ڕەخنەی کارەکی* بۆ فارسی وەرگێڕا و لە پۆلدا سەبارەت بە گیروگرفتەکانی دانانی هاوواتای فارسی بۆ چەمک و زاراوەکانی ئەو کتێبە قسەوباسی زۆر دەهاتنە ئاراوە. منیش هاوتەریب لەگەڵ ئەو باسانە دەمەویست توانستی زمانی کوردی لەو بوارەدا تاقی بکەمەوە. ئەو کاتە تەمەنم بیست ساڵ بوو و یەکەمین نووسینی من، کە وەرگێڕانی ئینگلیزیی شیعرێکی مەستوورەی کوردستانی بوو، لە گۆڤاری خوێندکارانی بەشی ئینگلیزیدا بڵاوکرابۆوە. کە وەرگێڕانی زاراوەکانی ڕەخنەی ئەدەبیم — لە ئینگلیزییەوە بۆ کوردی — لەگەڵ وەرگێڕانی ئینگلیزیی شیعرە کوردییەکەدا بەراورد دەکرد، تێگەیشتم جیاوازییەکی بنەڕەتی هەیە لە نێوان وەرگێڕانی زانستی و ئەدەبیدا. کتێبخانەی کوردی لەو سەردەمەدا، ئێستاشی لەگەڵدا بێت، لە ڕووی وەرگێڕانی ئەدەبییەوە دەوڵەمەندترە تا وەرگێڕانی زانستی. مەبەستیش لە وەرگێڕانی ئەدەبی، وەرگێڕانە بۆ کوردی چونکە مخابن ژمارەی هەوڵەکان لە وەرگێڕان بۆ زمانەکانی تر زۆر

کەمە. وەرگێڕانی زانستی، چ ئەو کات و چ ئێستاش، گەشەی بەرچاوی بە خۆیەوە نەبینیوە و زۆر دەقی گرنگی زانستی هەن کە هێشتا نەکراون بە کوردی. هەموو ئەمانە وای لێ کردم مکووڕتر بم لەسەر کۆکردنەوە و وەرگێڕانی چەمک و زاراوەکانی دەڤەری ڕەخنەی ئەدەبی بە تایبەتی و زانستە مرۆییەکان بە گشتی.

کە بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕووم لە بەشی ماستێری زمان و ئەدەبی ئینگلیزیی زانکۆی تاران کرد، لەوێش تێگەیشتم باسوخواسی وەرگێڕانی فارسیی زاراوە ئەدەبی و ڕەخنەییەکان مژاری گەرمی نێوان مامۆستایان و خوێندکارانە. پرۆفێسۆر بەهرام مێقدادی، مامۆستای ڕەخنەی ئەدەبیی ئەو بەشە، خەریکی ئامادەکردنی کتێبێک بوو بە ناوی *فەرهەنگی زاراوەی ڕەخنەی ئەدەبی*. کتێبی ناوبراو لە ۱۳۷۸دا (۱۹۹۹) بڵاوکرایەوە و لە گوتاری ڕۆشنبیری و ئەکادێمیکی ئێراندا کاریگەریی زۆری بەجێ هێشت. شیکاریی پێنج زاراوەی کتێبی ناوبراو لە ئەستۆی مندا بوو؛ ئەو وتارانەم سەرەتا بە کوردی دەنووسی و وەرگێڕانی فارسیم دەدایە مامۆستا؛ هەندێکیشیان کوردییەکەیان زووتر لە فارسییەکە بڵاو بوونەوە!

هاوکات لە کۆمەڵێ وتاردا بە ناوی «قوتابخانە ئەدەبییەکان لە ئەدەبی کوردیدا»، کە لە ساڵەکانی ۱۳۷۸ و ۱۳۷۹دا لە حەفتەنامەی *سیروان* بڵاوم کردنەوە، زاراوەکان و هاوواتا کوردییەکانیانم بە جیا تۆمار دەکرد. لە کۆمەڵە وتارێکی تردا بە ناوی «ڕەخنەی ئەدەبیی هاوچەرخ» کە لە سێزدە وتار پێک‌هاتبوو و سەرەتا لە *سیروان* و پاشان لە گۆڤاری *ڕامان* بڵاوکرانەوە ڕووبەڕووی وەرگێڕانی دەیان زاراوەی ڕەخنەیی بوومەوە. لە ۱۳۷۹دا لە گۆڤاری *ئاوێنە* وتارێکم بە ناوی «لێکدانەوەی چەند زاراوەیەکی ڕەخنەی ئەدەبی» بڵاوکردەوە. لە سەرجەم ئەم نووسینانەشدا زاراوەکانم بە ئینگلیزی و فارسی و کوردی تۆمار دەکرد. یەکەم هەوڵی پێشکەشکردنی ئەو زاراوانە وەک فەرهەنگۆک لە گۆڤاری *دەق*دا ئەنجام درا کە وەک پاشکۆ لە هەر دوو ژمارەی گۆڤارەکەدا لە ۱۳۷۹ و ۱۳۸۰ بەشێکم بۆ زاراوەکان بە چوار زمانی ئینگلیزی، فەرەنسی، فارسی و کوردی تەرخان کرد. دواتر لە کۆتایی وەرگێڕانی *دەربارەی دیالێکتیکی ڕۆشنگەری*، کە وەک کتێبی گیرفان لە دەزگای سەردەم لە ۲۰۰۱دا بڵاوکرایەوە. فەرهەنگۆکی زاراوەکانی ئەو نووسینەم دانا.

چاپی یەکەمی ئەم فەرهەنگەی بەردەست، بە ناوی *فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی* (ئینگلیزی-کوردی)، لە ساڵی ۲۰۰۲دا لە لایەن دەزگای سەردەمەوە لە سلێمانی بڵاوکرایەوە. هاوڕێی خۆشەویستم، کاک محەمەد مەحموودی (کۆزاد) زۆری یارمەتی دام و کتێبەکەشمان پاش

بڵاوبوونەوەی، کاریگەریی زۆری دانا بە شێوەیەک کە سەرجەم ژمارەکانی فرۆشران. لە پێشەکەیی کتێبەکەدا نووسینێکم بە ناوی «هەندێ ئاماژەی پێویست» پێشکەش کرد کە تێیدا باسی گرفت و ئاستەنگەکانی بەردەم زاراوەسازیم کردبوو. لە ٢٠٠٣دا، دەستمان کرد بە لێکدانەوەی ژمارەیەک زاراوەی ئەو کتێبە، کە لە ئەلفەوە بۆ کۆتایی جێ-ی دەگرتەوە، و وەک بەرگی یەکەمی *فەرهەنگی شیکارانەی زاراوەی ئەدەبی* لە دەزگای ئاراس لە هەولێر بڵاوکرایەوە. جارێکیان لە شاعیری گەورە و بەرپرسی ئەو کاتی دەزگای سەردەم، شێرکۆ بێکەس، داوام کرد کتێبەکە بنێردرێ بۆ چاپی دووەم. ئەو کتێبە زیاتر لە دوو هەزار زاراوەی لەخۆ گرتبوو و کاک شێرکۆ پێی وابوو باشترە کۆمەڵێ زاراوەی پێ زیاد بکرێ. بەداخەوە، بە هۆی کارکردن لەسەر هەندێ وتار و کتێبی تر، کە سەرجەمیان هەر ئەو ساڵانە بڵاوکرانەوە و هەروەهاش بە هۆی خوێندنی دوکتۆرا لە دوو وڵاتی هیند و بریتانیا چاپی دووەم ئامادە نەکرا. بەڵام من هەر بەردەوام بووم لە کۆکردنەوە و هاوواتادانان و نووسین سەبارەت بە زاراوەکان. لە نووسینەکانی ئەو ساڵانەدا سەبارەت بە زاراوەسازی دەتوانم ئاماژە بەو وتارانە بکەم کە لە گۆڤارەکانی *ئاینده و ڕامان* لە ٢٠٠٣ و ٢٠٠٤دا بڵاوم‌کردنەوە. لە پێشەکیی وەرگێڕانی کتێبەکەی باختین-یشدا قامکم لەسەر ئاستی پەرەسەندوویی زمانی کوردی دانا لە ڕووی زاراوەسازییەوە و، بەراوردکارییەکم پێشکەش کرد لە نێوان زمانی کوردی و فارسی لەم ڕووەوە.

زاراوە ئەدەبی و ڕەخنەییەکانی ئەو ساڵانەم لە سەرچاوەگەلی جیاجیاوە، وەک کتێب و وتار، کۆ دەکردەوە و چ ئەو سەردەمە و چ ئێستاش، وەک کەڵکەڵەیەکی سەرەکی، زەینی داگیر کردووم؛ لە ناو سەیارە، لە ناو فڕۆکە، لە سەر دەریا، لە کوێستان و چیا، لە گەشت و سەیران، لە بینینی بەرنامەی تەلەڤیزیۆنیدا و بە گشتی لە زۆربەی کایەکانی ژیاندا، لە لایەکەوە زاراوەم کۆ دەکردەوە و هاوکات هاوواتا فارسی و کوردییەکەشم دادەنا. ئێستاشی لەگەڵدا بێت بەردەوام بیر لە هاوواتاکانی ئەو زاراوانە دەکەمەوە. پێشتر لەگەڵ گەلێک مامۆستای پایەبەرزدا سەبارەت بەم کارە پرس و ڕاوێژم کردووە و ئێستاش بەردەوامم لەو کارە. کاتی وا هەبووە بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ شارەزایان دانیشتنی تایبەتم ساز داوە و بە چەندین سەعات لەسەر هاوواتای کوردیی یەک زاراوە قسەمان کردووە؛ مامۆستایان ئەحمەد قازی، شوکور مستەفا، مارف خەزنەدار، و دەیان مامۆستا و توێژەری تر ڕوانگە و نێرینی بەنرخیان پێشکەش کردووە و لەوانەوە گەلێک خاڵی گرنگ سەبارت بەم پرسە فێر بوومە.

له ساڵی ۲۰۱۰دا له بریتانیاوه گەڕامەوه بۆ زانکۆی کوردستان له سنه و ئەمجارەیان به هۆی سەرپەرشتی کردن یان هەڵسەنگاندنی تێزی ماستێر و دوکتۆراوه ڕووبەڕووی دەیان زاراوەی نوێ له تێزەکاندا بوومەوه؛ هەمووشیانم تۆمار دەکرد و ژمارەی زاراوەکان تا دەهات زیاتر دەبوو. که بەشی زمان و ئەدەبی کوردی له زانکۆی کوردستان له ۲۰۱۵دا کرایەوه، به تەواوی هەستم به کەموکۆڕییەکان لەم بوارەدا کرد. مامۆستایانی بەش بەردەوام پرسیاریان سەبارەت به هاوواتای کوردیی زاراوەکان دەکرد. خەڵکی دەرەوەی زانکۆش هەر سەبارەت بەم پرسه بەردەوام پێوەندییان پێوه دەکردین. له هەندێ لەو وانانەی بۆ خوێندکارانی ئاستی کارناسی، ماستێر و دوکتۆرای ئەدەبی ئینگلیزیم له سنه و تاران دەوتەوه بەردەوام ڕووبەڕووی زاراوه و چەمکی نوێ دەبوومەوه. ئێمه له پۆلەکانی بەشی ئینگلیزیدا له سەرجەم وانەکاندا ڕووبەرووی زاراوەکان دەبینەوه، بەڵام له وانەگەلی زاراوه ئەدەبییەکان، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕێبازه ئەدەبییەکان، ڕێبازناسیی لێکۆڵینەوه و فەلسەفەی ئەدەب له هەر سێ ئاستی خوێندندا زیاتریان هەست پێ دەکەین. هەر ئەم کەشه به شێوەیەکی تر له پۆلەکانی بەشی کوردیدا له ئارادا بوو و هەشه. لەو وانانەی له ئەستۆی مندا بوون زیاتر له ڕێبازه ئەدەبییەکان، شێوازناسی و ڕەخنه و تیۆریی ئەدەبیدا بابەتەکه بەرجەسته دەبووەوه. بۆیەش له دانانی نامیلکه و سەرچاوەی خوێندن بۆ ئەو وانانه بەردەوام ڕووبەڕووی پرسی زاراوەسازی دەبمەوه. سەرچاوەش لەم بوارەدا کەمه و ئەمەش تا ئەو ئاستەی که کاتێ له ۲۰۰۲دا بەرنامەی خوێندنی کوردیم بۆ ئاستی کارناسی له زانکۆی کوردستان دادەڕشت، له ناو پێڕستی سەرچاوەکاندا ئاماژەم بۆ ژمارەیەکی زۆر کەمی بەرهەم کرد چونکه کتێبخانەی کوردی به تایبەت لەو ساڵانەدا لەم ڕووەوه زۆر کز و لاواز بوو. دواتر له ۲۰۱٦دا که له لایەن وەزارەتەوه ناچار کراین به بەرنامەی خوێندنی بەشی کوردیدا بچینەوه، هەندێ سەرچاوەی تازەی زاراوەسازیم پێ زیاد کردن. تەنانەت له وانەکانی بەرنامەی خوێندنی کوردی بۆ ئاستی ماستێر له زانکۆکانی ئێران — که له ۲۰۱۷دا له لایەن زانکۆی کوردستانەوه ڕەوانەی وەزارەتی خوێندنی باڵا کرا — وانەیەکی بژاردەم به ناوی «وەرگێڕانی زانستی» له ناو وانەکاندا مسۆگەر کرد و له پێناسه و شرۆڤەی وانەکەشدا ئاماژەم بۆ دەوری وەرگێڕانی زاراوەکانی دەقه زانستییەکان کرد.

له لایەکی ترەوه، له دەرکردنی گۆڤاری *پژوهشنامه ادبیات کردی*دا زیاتر له جاران هەستمان به کەموکۆڕییەکان کرد لەم ڕووەوه. پاش چەند ساڵ له دەرکردنی ئەو گۆڤاره بەداخەوه تەنانەت یەک وتاریشمان لەسەر وشەڕۆنان و زاراوەسازی بۆ نەهاتووه! له ۲۰۱٦دا بەشێک له زاراوەکانم، که ژمارەیان نزیکەی پێنج هەزار بوو، لەگەڵ هاوواتای فارسی و کوردیدا پێشکەشی توێژینگەی

کوردستانناسیی زانکۆی کوردستان کرد. بە هاوواتاکانی چاپی یەکەمیشدا چوومەوە و زۆربەشیانم گۆڕی. لە ئەنجامدا پێداچوونەوەی دووەمی زاراوەکان لە لایەن توێژینگەوە پەسەند کران و ئێستا لەوێ بە شێوەی گەڵاڵە لەبەردەستە و لە لایەن توێژەر و خوێندکارانەوە بەکار دەهێنرێت. لە پاڵ ئەمەشدا، پێشنیازی دانانی لیژنەیەکم بە ناوی زاراوەسازی و وشەڕۆنان، ئاراستەی بەرپرسانی توێژینگەی کوردستانناسی کرد کە مخابن تا ئێستا نەچووەتە بواری جیبەجێکردنەوە. چیرۆکەکە کۆتایی نەهات، بە حوکمی ئەوەی ژمارەی ئەو زاراوانەی ڕۆژانە لە ناو دەقە ئینگلیزییەکاندا سەروکارم لەگەڵیان هەبوو بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر ڕووی لە زیادبوون دەکرد. هاوکات چەندین کتێب بە فارسی بڵاو بوونەوە کە زاراوەی تازەتریان لەخۆ گرتبوو؛ لە لایەکی تریشەوە، چەندین کتێب بە کوردی بڵاوکرانەوە کە زاراوەسازییەکەیانم بە دڵ نەبوو. هەر بۆیەش کۆمەڵێ وتارم بەناوی «وەرگێڕانی چەمک و زاراوە ڕەخنەیی و تیۆریکەکان» لە حەفتەنامەی چرۆ و دواتر لە گۆڤاری *ڕامان* بڵاوکردەوە.

ئەم فەرهەنگەی بەردەست نزیکەی ٧٠٠٠ زاراوەی لەخۆ گرتووە؛ واتە، ژمارەی زاراوەکانی سێ هێندەی چاپی یەکەمە. بێجگە لەوەش، بە سەرجەم هاوواتاکاندا چووەمەتەوە. هەندێکیان بە باشی و بە دروستی دانرابوون و جێگەی خۆیان لە ناو زمانی کوردیدا گرتەوە؛ هەندێکیشیان بە دروستی دانەنرابوون یاخود بە هۆی ئەوەی تەنها لە دەقە پسپۆڕانەکاندا بەکار دەبرێن ڕواڵەتێکی گشتگیریان نەگرتە خۆ. لەم چاپەی ئێستادا بە پێویستم زانی هاوواتای فارسییش بخەمە سەر زاراوەکان. هەروەهاش، بە هۆی ئەو پێوەندییانەی بەم دواییانە لە نێوان ئێمە و نووسەران و زانکۆکانی باکووری کوردستاندا ساز بوونە، بە پێویستم زانی هاوواتای کورمانجیشیان پێ زیاد بکەم. لە لایەکی ترەوە، بە هۆی سروشتی نێوانبواریی ڕەخنەی ئەدەبییەوە زاراوەکانی زانستە مرۆییەکان و بە تایبەت دەقەری زمانناسی، کۆمەڵناسی، دەروونناسی و دەروونشیکاری و بوارەکانی تریش بەم چاپەی ئێستا زیاد کراون.

## ئاستەنگەکان و ڕێبازی کار

وشەڕۆنان بە گشتی و زاراوەسازیی ئەدەبی، ڕەخنەیی، تیۆریک و زانستی بە تایبەتی، لەم ساتەوەختەی گوتاری ڕەخنەیی ئەدەبی کوردیدا بە هەر دوو بەشی ئەکادێمیک و دەرەوەی ئەکادێمیادا و هەروەهاش بە سەرنجدان بە ئاست و چۆنایەتیی بەکارهێنانی ڕۆژانەی هەندێ دەستەواژە و وشەی گشتی لە لایەن خەڵکی ئاساییەوە و لە ڕاگەیاندن و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانیشدا بە پێویستییەکی حاشاهەڵنەگر ئەژمێردرێ. سەبارەت بە توێژینەوەکانیش، ئەم پرسە بۆتە یەکێک لە کێشە هەرە گرنگەکانی بەرهەمهێنان و یاخود وەرگێڕانی دەقە ڕەخنەیی و زانستی و فیکرییەکان لە قۆناغی هەنووکەییماندا. لێکۆڵینەوەی ئەم پرسە زێدە گرنگە لە ڕواڵەتی پرۆژەیەکی دامەزراوەییدا مخابن لە گۆڕێدا نییە و ئەگەر کەسانێکیش دەستیان داوەتە ئەم کارە، پتر تەقەلای تاکەکەسین. لە هەندێ نموونەشدا دەرئەنجامی ئەو جۆرە کارانە ناتەواوییان پێوە دیارە و تەنانەت چەوتتێگەیشتن و هەڵەی زەقوزۆپیشیان لێ کەوتۆتەوە. هەندێ جار ئەم پرسە لە سەر دەستی هەندێ نووسەر بە شێوەیەکی پڕ لە هەڵە و ناڕاست ئاراستە کراوە و بۆتە هۆی ڕاچەڵەکاندنی ئەو نووسەرانەی دەمێکە خۆیان بە پاراستن و پەرەسەندنی زمانی کوردییەوە ماندوو کردووە.

زۆربەی هەرە زۆری نووسەرانی کوردینووس لەبەر گرنگینەدان بە دانان یان وەرگێڕانی دەقە ڕەخنەیی و زانستییەکان و بە هۆی بەرهەمنەهێنانی دەقی تیۆریک و زانستی بە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشە و قەیرانە تیۆریکەکانی گوتارە جیاجیاکانی زانستە مرۆییەکان لە بەستێنێکی کوردیدا و لە ناو زمانی کوردیدا، زیاتر لە جاران بوونەتە هۆکاری پشتگوێخستنی ئەم مژارە هەرە گرنگەی پەرەسەندنی زمانی کوردی. لە پاڵ ئەمەشدا، بە هۆی کەمتەرخەمیی بەرپرسان و فەرمانبەرانی هەندێ دامودەزگای کاریگەرەوە، وەک ڕادیۆ و تەلەڤیزیۆن، ڕەوتی وشەڕۆنان و زاراوەسازی لە زمانی کوردیدا بە شێوەیەکی لاواز و لاوەکی و تەنانەت نادروست لە ئارادایە و ئێمەمانان ڕۆژ نییە ئەو نموونانەمان وەبەرچاو نەکەوێ. گەرچی گەلێک جاران گرنگایەتیی ئەم پرسەم وە بیر بەرپرسانی ئەوسا و ئێستای ئەکادێمیای کوردی، زانکۆکانی کوردستان و سەلاحەدین و سلێمانی هێناوەتەوە، بەڵام ئەوانیش بە هۆی گرنگیدانیان بە بابەتی مێژوویی و ئەدەبیی کلاسیکەوە و یاخود بە هۆی ئامادەنەبوونیان لە گوتاری بەرهەمهێنانی زانست بە زمانی کوردی، ئەو پێشنیاز و نێرینانەیان مخابن تا ئێستا خستۆتە پەراوێزەوە.

یەکێک لە مەبەستە سەرەکییەکانی من لە دانانی ئەم فەرهەنگە، دەرخستنی جیاوازییەکانی نێوان دوو جۆر زمانە کە ئەوانیش زمانی ئاسایی و گشتی و زمانی زانستین. دەکرێ لە ڕوانگەیەکی ترەوە باس لە خاڵە جیاوازەکانی دوو جۆر زمانی تر بکەین کە بریتین لە زمانی ئاسایی و زمانی ئەدەبی. هەروەهاش دەتوانرێ قامک بخرێتە سەر جیاوازییەکانی نێوان زمانی ئەدەبی و زمانی زانستی. کەواتە، دەکرێ لە سێ ڕوانگەی جیاوازەوە باس لە سێ جووت زمانی جیاواز بکرێ کە بریتین لە زمانی ئاسایی/زمانی زانستی، زمانی ئاسایی/زمانی ئەدەبی و زمانی ئەدەبی/زمانی زانستی. لێرەدا مەبەست زیاتر نیشاندانی جیاوازییەکانی زمانی ئاسایی و زمانی زانستییە و باسکردن لە تایبەتمەندییەکانی ئەو دوو جووتەکەی تر دەچێتە خانەیەکی ترەوە کە ئەویش ئاقاری تیۆریی ئەدەبییە و هەر بۆیەش لێرەدا باسیان لە سەر ناکەم. لە لێکۆڵینەوەی جیاوازییەکانی جووتی یەکەم، واتە زمانی ئاسایی و زمانی زانستی، پێویستە سەرەتا ئەوە بڵێم کە مەبەست لە زمانی زانستی زمانی دەقە زانستی و تیۆریک و فەلسەفییەکانە. یەکێک لە مۆرکە بنچینەییەکانی زمانی فەلسەفە و زانست ئەوەیە کە لەوێ هەر چەمکەو خاوەن دەلالەت و پێناسەی تایبەتی خۆیەتی و گەلێک لقوپۆپی ورد و جیاجیای لێ بۆتەوە کە سەرجەمیان بە شێوەکی زانستی پۆلێن کراون. لە فەلسەفە و زانستدا، بە پێچەوانەی زمانی ئاسایی، ناکرێ و ناشبێ لە خۆڕا پەل بۆ چەمکەکان بهاوێژین و بەکاریان بەرین، کەچی لە زمانی ئاسایی و ڕۆژانەدا لەوانەیە چەمکەکان جێگۆڕکێیان پێ بکرێ و کەسیش سەرنجیان نەداتێ.

مەبەستێکی تر لە دانانی ئەم فەرهەنگە بریتییە لە هەوڵدان بۆ دانان و گشتگیرکردنەوە و مسۆگەرکردنی شێوازی زانستی لە زمانی کوردیدا بە شێوەیەکی پاراو و یەکگرتوو (لێرەدا ئاوەڵناوی زانستی-م بە مانا بەربڵاوەکەی بەکار هێناوە کە تەنها لقە زانستییەکان وەک بیرکاری و مەنتیق نەگرێتەوە و بەڵکوو دەقە فەلسەفی و تیۆریکەکانیش بگرێتەوە). ئەمەش ئامانج و خواستی سەرجەم ئەو کەسانەیە کە لە بوارە جیاجیاکاندا بە کوردی دەنووسن. هۆکارەکەشی ئاشکرایە و دەگەڕێتەوە بۆ پەرەنەسەندن و گەشەنەکردنی شێوازی زانستی لە زمانی کوردیدا بە شێوەیەکی بەربڵاو، بەردەوام و گشتگیر لە بەراورد لەگەڵ زمانە زیندووەکانی جیهاندا و تەنانەت لە چاو زمانە دراوسێکانی وەک فارسی و عەرەبی. چەندین هۆکاری جیاجیا لە پشت ئەم گەشەنەکردنەوەیەدان، چ لە ڕابردوو و چ لە ئێستادا، کە ئێرە شوێنی باسکردنیان نییە و پێشتر ئاماژەم بۆ کردوون. کەسانێکی وەک من ڕۆژانە ڕووبەڕووی هەڵەی زەقی ناو دەقە جیاجیاکان

دەبنەوە، چ دەقی نووسراو بێت یان دەقی بەرنامە و هەواڵێکی ڕادیۆیی و تەلەڤیزیۆنی و یاخود دەقی دانراو لە ماڵپەڕێکی ناو ئینتێرنێتدا.

ڕەخنەی ئەدەبیی مۆدێرن، بە هۆی تێکەڵاویی زۆری لەگەڵ تیۆریی ئەدەبی و فەلسەفەی هاوچەرخ و لقەکانی دیکەی زانستە مرۆییەکاندا، کۆمەڵێ زاراوەی نوێی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتە ناو زمانەوە؛ ئەوەتا کە باسی تیۆری و ڕەخنە دێتە پێشێ، سەدان زاراوەی نەبیستراو قوت دەبنەوە کە زۆربەیان نەک هەر بۆ خوێنەری ئاسایی بەڵکوو تەنانەت بۆ توێژەران و خوێندەوارانیش نامۆ و شاراوە دەنوێنن. خوێنەری ئاسایی کورد کە بەشێکی زۆریان لە سەر دەستی غەزەڵبێژانی لاساییکەرەوەی قوتابخانەی نالی، سالم، کوردی و مەحوی پەروەردە کراون یا خود شەیدای سامانی وێژەی گۆرانین، یاخود گوێیان بە دروشمی زانستی و ئایدیۆلۆجیکی نێو بەرهەمە بەناوبانگەکانی شیعری سۆرانیی ناوەڕاستی سەدەی بیستەم ڕاهاتووە، یان لە لایەن شیعری پڕجۆش و خرۆش و یاخود وتەی بریقەداری سەردەمی شەڕ و ململانێکانەوە نەشونمایان کردووە، بە گشتی لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ڕەخنەی ئەدەبیی مۆدێرندا سڵ ئەکەنەوە و زۆر جار دەکەونە نێو بازنەی تێنەگەیشتن و ناکارامەییەوە. ئەوەتانێ بیر و بیرۆکە و، کەواتە، زاراوە کلاسیک و گشتی و نەریتییەکان ڕۆژانە دووبارە و چەندبارە دەبنەوە و ئەمەش بۆتە هۆی سازبوونی لەمپەر لە پێناو بەرهەمهێنانی دەقی زانستی بە زمانی کوردیی پاراو و یەکدەست.

ئێمە زیاتر لە جاران پێویستمان بە خستنەڕووی بنەواشە و ڕێساکانی وشەڕۆنان و زاراوەسازییە. پێویستە سەرنجی زیاتر بدەین بەو لایەنانەی پێوەندییان بە توانستی زمانی کوردییەوە هەیە لەم پێناوەدا (وەک ئاوڕدانەوە لە سەرجەم پێشگر و پاشگر و ناوگرەکانی سەرجەم شێوەزارەکانی زمانی کوردی). بایەخدان بە مۆرکە ئاشکرا و شاراوەکانی زمانی کوردی چ لە ڕووی ڕستەسازی، پێکهاتەناسی و بە تایبەت دەستەواژەسازییەوە و چ لە باری وشەناسییەوە ئاماژەن بۆ پۆتانسیەل و توانستەکانی ئەم زمانە لە وشەڕۆنان و زاراوەداناندا. تایبەتمەندیی سەرجەم زار و بنزار و شێوەزارەکانی زمانی کوردی یارمەتیدەرمانن لەم پێناوەدا. پێویستە کەڵک لە قامووسی بەرفراوانی وشەی سەرجەم شێوەزارەکان وەربگرین و لە وشەبژێریدا ڕەچاویان بکەین.

لەم کتێبەدا زاراوەکانی تایبەت بە بوارەکانی زانستە مرۆییەکان و نەخاسما ڕەخنە و تیۆریی ئەدەبی وفەرهەنگی بە فارسی و بە کوردیی سەروو و ناوەندی دانراون. لە وشەڕۆنان و زاراوەسازیی ئەم چەمکانەدا بەو پەڕی هەستیاری و وردبینییەوە مامەڵەم لەگەڵ ڕەوتی دانانی هاوواتاکاندا کردووە. زمانی زانستی و فەلسەفی، تەژییە لە چەمک و زاراوەگەلی پسپۆڕانە و تایبەتمەند

دەبنەوە، چ دەقی نووسراو بێت یان دەقی بەرنامە و هەواڵێکی ڕادیۆیی و تەلەڤیزیۆنی و یاخود دەقی دانراو لە ماڵپەڕێکی ناو ئینتێرنێتدا.

ڕەخنەی ئەدەبیی مۆدێرن، بە هۆی تێکەڵاویی زۆری لەگەڵ تیۆریی ئەدەبی و فەلسەفەی هاوچەرخ و لقەکانی دیکەی زانستە مرۆییەکاندا، کۆمەڵێ زاراوەی نوێی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتە ناو زمانەوە؛ ئەوەتا کە باسی تیۆری و ڕەخنە دێتە پێشێ، سەدان زاراوەی نەبیستراو قوت دەبنەوە کە زۆربەیان نەک هەر بۆ خوێنەری ئاسایی بەڵکوو تەنانەت بۆ توێژەران و خوێندەوارانیش نامۆ و شاراوە دەنوێنن. خوێنەری ئاسایی کورد کە بەشێکی زۆریان لە سەر دەستی غەزەڵبێژانی لاساییکەرەوەی قوتابخانەی نالی، سالم، کوردی و مەحوی پەروەردە کراون یا خود شەیدای سامانی وێژەی گۆرانین، یاخود گوێیان بە دروشمی زانستی و ئایدیۆلۆجیکی نێو بەرهەمە بەناوبانگەکانی شیعری سۆرانیی ناوەڕاستی سەدەی بیستەم ڕاهاتووە، یان لە لایەن شیعری پڕجۆش و خرۆش و یاخود وتەی بریقەداری سەردەمی شەڕ و ململانێکانەوە نەشونمایان کردووە، بە گشتی لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ڕەخنەی ئەدەبیی مۆدێرندا سڵ ئەکەنەوە و زۆر جار دەکەونە نێو بازنەی تێنەگەیشتن و ناکارامەییەوە. ئەوەتانێ بیر و بیرۆکە و، کەواتە، زاراوە کلاسیک و گشتی و نەریتییەکان ڕۆژانە دووبارە و چەندبارە دەبنەوە و ئەمەش بۆتە هۆی سازبوونی لەمپەر لە پێناو بەرهەمهێنانی دەقی زانستی بە زمانی کوردیی پاراو و یەکدەست.

ئێمە زیاتر لە جاران پێویستمان بە خستنەڕووی بنەواشە و ڕێساکانی وشەڕۆنان و زاراوەسازییە. پێویستە سەرنجی زیاتر بدەین بەو لایەنانەی پێوەندییان بە توانستی زمانی کوردییەوە هەیە لەم پێناوەدا (وەک ئاوڕدانەوە لە سەرجەم پێشگر و پاشگر و ناوگرەکانی سەرجەم شێوەزارەکانی زمانی کوردی). بایەخدان بە مۆرکە ئاشکرا و شاراوەکانی زمانی کوردی چ لە ڕووی ڕستەسازی، پێکهاتەناسی و بە تایبەت دەستەواژەسازییەوە و چ لە باری وشەناسییەوە ئاماژەن بۆ پۆتانسیەل و توانستەکانی ئەم زمانە لە وشەڕۆنان و زاراوەداناندا. تایبەتمەندیی سەرجەم زار و بنزار و شێوەزارەکانی زمانی کوردی یارمەتیدەرمانن لەم پێناوەدا. پێویستە کەڵک لە قامووسی بەرفراوانی وشەی سەرجەم شێوەزارەکان وەربگرین و لە وشەبژێریدا ڕەچاویان بکەین.

لەم کتێبەدا زاراوەکانی تایبەت بە بوارەکانی زانستە مرۆییەکان و نەخاسما ڕەخنە و تیۆریی ئەدەبی وفەرهەنگی بە فارسی و بە کوردیی سەروو و ناوەندی دانراون. لە وشەڕۆنان و زاراوەسازیی ئەم چەمکانەدا بەو پەڕی هەستیاری و وردبینییەوە مامەڵەم لەگەڵ ڕەوتی دانانی هاوواتاکاندا کردووە. زمانی زانستی و فەلسەفی، تەژییە لە چەمک و زاراوەگەلی پسپۆڕانە و تایبەتمەند

کە دەوری سەرەکییان هەیە لە پێشکەش‌کردن و بەربڵاوترکردنەوەی گوزارە و بەڵگاندنەکان. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژمارەیان لە زیادبووندایە و ئەمەش تا ئەو ئاستەی ئاساییە کتێبێکمان هەبێ بە ناوی فەرهەنگی زاراوەکانی تایبەت بە ڕەخنەگر یان تیۆری‌دارێژێک؛ بۆیەش ئیمڕۆژە لە گوتاری ئەکادێمیکدا کتێبی زۆری لەو چەشنەمان لەبەر دەستە کە بە شێوەی پسپۆڕانە و ورد تەرخان کراون بۆ لێکدانەوەی زاراوەی تایبەتمەندی بیرمەند یان سیستەمێکی تایبەتی بیرکردنەوە.

گەرچی هەندێ لە هاوواتا و زاراوەکان بە ڕواڵەت هەر یەکێکن، بەڵام لە وشەڕۆنان و زاراوەسازی و لە وەرگێڕانیشدا بچووکترین جیاوازی دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی پێناسەی جیاواز. لەوانەیە لە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەماندا لەگەڵ هەندێ لە زاراوەکاندا وا هەست بکەین جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوانیاندا نییە، کەچی ئەمە ڕێوڕاست هەمان تایبەتمەندیی ساکارسازی و گشتیکردنەوە و کورتوکۆکردنەوەیە کە لە زمان و زەمینەیەتی سونەتیدا ڕەنگ دەداتەوە. ئەم مۆرکانە بە شێوەیەکی زەقوزۆپ لە زمانی کوردیدا بە گشتی و لە دەقە فەلسەفی و زانستییەکاندا بە تایبەتی دەبیندرێن. لێرەدا سەرنجدان بە هاوپێوەندیی دوولایەنە و پێچەڵپێچی نێوان زمان و زەمینییەت لە لایەکەوە و پرۆسەی فرەڕەهەندی بنیاتنرانی ناسنانە لە ڕێگەی و بە هۆی زمانەوە لە لایەکی ترەوە پێویستە.

لە لایەکی ترەوە، زۆربەی ئەو وەرگێڕە کوردانەی لەم ساڵانەی دواییدا دەستیان داوەتە وەرگێڕانی دەقە فەلسەفی و تیۆریک و ڕەخنەگرانەکان ئاشناییان لەگەڵ لانی کەم یەکێک لەو زمانانەدا نییە کە ڕەگیان لە زمانی لاتیندایە یان لە ژێر کاریگەرێتی ئەو زمانەدا گەشەیان سەندووە. هەر بە هەمان شێوەش، وەرگێڕی ئەو جۆرە دەقانە پێویستە ئاشنایی لەگەڵ دەقە کۆنەکانی نەریتی فەلسەفەی ئیسلامیدا هەبێ و با ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە ئەوڕۆکە بەشێکی زۆری چەمکە فەلسەفییەکانی دەقە تیۆریک و ڕەخنەگرانەکان بە جۆرێک لە دەقەکانی نەریتی فەلسەفەی ئیسلامیی سەدەگەلی ڕابردوو وەرگیراون. هەربۆیە زۆرجار لە کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە و ماڵپەڕە کوردییەکاندا بینیومە کە وەرگێڕ هاوواتای فارسی یان عەرەبیی چەمکێکی بە ڕەچەڵەک لاتینی کردووە بە کوردی کە بۆخۆی گەلێک لە مانای ڕەسەنی چەمکەکەوە دوورە. یان، بە پێچەوانەوە، وەرگێڕ ئاماژە بۆ تەنها یەکێک لە دەلالەتەکانی چەمکی بەرباس دەکات؛ ئەمەش ئەو دەلالەتەیە کە تەنها لە یەک نەریتی فەلسەفیدا باوی هەیە. لە پاڵ ئەمانەشدا، هەندێ جار ئەو زاراوانە لە لایەن وەرگێڕانی فارس و عەرەبەوە بە هەڵە و بە شێوەیەکی نادروست وەرگێڕدراون. هەر ئەم نموونەیەم بەم دواییانە لەو کتێبانەدا وەبەرچاو

کەوت کە لە فارسییەوە وەرگێڕدراون. لەم نموونانەدا زۆربەی هەرە زۆری زاراوەکان لە فارسییەوە وەرگێڕدراون و خاڵی سەیریش ئەوەیە کە هاوواتا ئینگلیزییەکانی ئەو زاراوانە لە کتێبەکەدا دانراون، ئەویش بەبێ ئەوەی دانەری فەرهەنگەکە دەقە فەلسەفییەکانی بە ئینگلیزی خوێندبێتەوە یان لە وەرگێڕانی کوردیی ئەو چەمکانەدا ئاوڕی لە زاراوە ئینگلیزییەکان دابێتەوە. کۆمەڵێ زاراوە لە فارسیدا هاوواتای عەرەبییان بۆ دانراوە و بە تەواوەتی لە زمانی زانستی و فەلسەفیی فارسیدا جێگیر بوونە. ئەم جۆرە زاراوانە زۆرجار لە وەرگێڕاندا گرفت بۆ وەرگێڕی کورد دروست دەکەن. یەکێک لە ڕێگاکانی چارەسەرکردنی ئەم گرفتە ئەوەیە کە سەرەتا بە وردی سەرنج بدەینە واتای چەمکەکە بەو شێوەیەی لە نەریتی فەلسەفیی ئیسلامیدا بەکارهاتووە و پاشان پێویستە چەمکەکە بەو شێوەیەی لە لاتینیدا بەکار هێنراوە شیبکرێتەوە. لە قۆناغی دواییدا، ئەبێ بە دوای ڕەگوڕیشەکەیدا بگەڕێین یان مۆرفیمە پێکهێنەرەکانی لێکبدەینەوە.

لەم فەرهەنگەی بەردەستدا تەنها گرنگی بە هاوواتای کوردیی زاراوەکان نەدراوە و سەرنجی زۆریش دراوە بە زاراوە فارسییەکان. لە هەندێ نموونەدا وەرگێڕان و شێوەی باوی بەکارهێنانی زاراوە فارسییەکانم دووبارە نەکردۆتەوە لەبەر ئەوەی پێم وابووە هەڵگری کەمایەسین. بەشێکی هاوواتا کوردییەکان بۆ یەکەم جارە لێرە دانراون و بەشێکی تریان کە لە نوسخەگەلی پێشووشدان لێرە بوونەتە خاوەنی هاوواتای نوێ. سەرەتا هاوواتا پێشنیازکراوەکان لێکدراونەتەوە و پاشان هەوڵ دراوە تا ئەو جێگەیەی دەکرێ لە بێژە و زاراوەگەلی باوی زمانی فارسی و کوردی کەڵک وەربگیردرێ. بەشێکی زۆری زاراوە پێشنیازکراوەکان لە کتێبە جیاجیا فارسی و کوردییەکاندا هەڵگری کەماسین و هەندێکیشیان بە هەڵە و تەنانەت سەیروسەمەرەش کراون بە فارسی و کوردی. بۆیەش هەوڵم داوە سەرەتا بە شێوەی ڕەخنەگرانە ڕووبەڕووی ئەو زاراوەگەلە ببمەوە و گەر هاوواتایەکم بە دڵ نەبوویێت، با ئەگەر گشتگیریش بێت، نەمهێناوە.

هەندێ جار وەرگێڕانی زاراوەکان لە لاتینییەوە بۆ کوردی گەلەک ئاسانترە لە وەرگێڕانی هاوواتای ئەو زاراوەیە بەو چەشنەی لە زمانی فارسی و عەرەبیدا بەکار دەهێنرێ. وەرگێڕان لە زمانی یەکەمەوە دەتوانێ دەرئەنجامێکی دروستی لێ بکەوێتەوە تا ئەوەی بێین و هاوواتا فارسی و عەرەبییەکانی ئەو چەمکانە وەربگێڕین بۆ کوردی. لەم فەرهەنگەدا لە چەندین نموونەدا ئەو خاڵە دەبینرێ، وەک لە زاراوەگەلی writerly، readerly و intentionality. زمانی کوردی هەندێ جار، وەک ئەم نموونەیەی ئێستا، وەرگێڕی کورد سەرخۆش دەکات ئەویش بە هۆی توانستەکانیەوە لە باری ڕێسا ڕێزمانییەکانەوە و یان بە هۆی زۆریوبۆریی پاشگر و

پێشگرەکانەوە و یاخود دەوڵەمەندبوونیەوە لە ڕووی فرەیی وشە و چەمکەکانەوە، بەڵام، زۆربەی کاتەکان هەمان وەرگێڕ تووشی تووڕەیی و سەرئێشە دەکات.

سەبارەت بە شێوەی جیاوازی نووسینەوەی شێوازی نووسین و قسەکردن، لەم فەرهەنگەدا بە هەستیارییەوە مۆرکەکانی زمانی نووسین، نەک شێوەی ئاخاوتن، ڕەچاوکراون. بۆ نموونە، دەستکەوت لەبری دەسکەوت، دەستنیشان لەبری دەسنیشان و لەدەستدان لەبری لەدەسدان بەکارهێنراون. من پێم وایە گەر لەبری چەند بنووسریَ چەن، ڕێک وەک ئەوە وایە لەبری هەندێ بنووسین هەنیَ. ئەم دیاردەیە زۆرتر لە ڕۆژهەڵاتدا دەبیندریَ و هۆکارەکەشی نائاشنابوونە لەگەڵ دەقی کوردیدا. گەر نووسەر ئەزموونی پتەوی لە خوێندنەوەی دەقی کوردیدا هەبیَ، تێدەگا لە نووسینی کوردیدا کەس چەن لەبری چەند بەکار ناهێنیَ؛ مەگەر ئەوەی لە دیالۆگی ژانرێکی ئەدەبیدا بێت، یان نووسەر بە ئەنقەست بەکاری هێنابیَ. نموونەکانی تر بریتین لەمانە: لە ماڵدا لەبری لە ماڵا، لە سنەوە بۆ بۆکان لەبری لە سنەو بۆ بۆکان، بە بۆنەی ئەم پرسەوە لەبری بە بۆنەی ئەم پرسە و هتد.

لەم فەرهەنگەدا هەر دوو هاوواتای کوردیی سەروو و ناوەندیم بە ئەنقەست بە ئاوەڵناوی جیاوازەوە بەکار هێناوە. بۆ نموونە، هەر دوو زاراوەی «کۆمەڵناسیی لادێیی» و «جڤاکناسیی گوندی»، کە یەکێکن و هاوواتای یەک زاراوەشن (rural sociology)، لە هەر دوو بەشی کوردیی سەروو و ناوەندیدا بەکارهێنراون. دیارە لە هەر دوو بەشەکەشدا ڕێسای ڕێزمانیی تایبەت بەو زارە ڕەچاو کراوە و بۆیەش لە بەشی کورمانجیدا دوو زاراوەی ئاماژەبۆکراو بە شێوەی civaknasiya ladêyî و komelnasiya gundî دانراون. یان، هەر دوو دەستەواژەی ڕێوڕەسمی ئۆلی و ئاهەنگی ئایینی لەگەڵ کورمانجییەکەیاندا بە شێوەی rêûresma olî و ahenga ayînîدانراون. نموونەیەکی تر بریتییە لە «ئاستەنگەکانی توێژینەوە» و «بەربەستگەلی لێکۆڵینەوە» کە لە بەشی کورمانجیدا بە شێوەی astengiyên vekolînê و berbestên tiwêjîneweyê تۆمار کراون. وەک لەم نموونەیەی دواییدا دیارە، کەڵک لە دوو پاشگری جیاوازی کۆسازی «کان» و «گەل» وەرگیراوە. یان گەرچی «کۆمەڵکوژیی فەرهەنگی» بە کورمانجی دەبێتە komkujiya çandî، بەڵام هەمان زاراوە بە ئەلفوبێی ڕۆمی (لاتینی) و لە بەشی سەرووودا دانراوە. گەر زاراوەکەش هەڵگری دوو واتای تەواو جیاواز بێت، بە ژمارە دیاری کراوە و لە دوو خانەی جیاوازدا دانراوە.

## سپاسگوزاری

پڕ بە دڵ سپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی هەموو ئەو ئازیز و خۆشەویستانە دەکەم کە بە شێوەگەلی جیاجیا هاندەر و پشتیوان و هاوکارم بوون لە بەڕێوەبردنی ئەم ئەرکە گرانەدا. لێرەدا نابێ چاوپۆشی لە هەوڵ و ماندووبوونی هاوکار و هاوڕێی هێژام بەڕێز کاک مەزهەر ئیبراهیمی بکەم کە وەک توێژەرێکی لێهاتوو بە گیانی دڵسۆزی و بەرپرسیارییەوە گەلێک هاوکاریی کردم و بە پێشنیازە سەرنجڕاکێشەکانی خۆی، ئەم بەرهەمەی بەردەستی دەوڵەمەندتر کرد. لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ هەوڵ و تەقالاکانی بەڕێز کاک توورەج خوسرەوەی بکەم کە وەک خوێندکاری هەر دوو بەشی زمان و ئەدەبی کوردی و فارسی لە زانکۆی کوردستان هەردەم ئامادە بوو بۆ هاوکاری کردن لەم کارەدا و گەلێک ئەرکی گرانی ئەم کارەی لە ئەستۆ گرت. سپاسی بەڕێز کاک ئیبراهیم شادمان دەکەم کە لە دانانی هاوواتای کورمانجیی زاراوەکاندا زۆری یارمەتی دام. هەروەهاش، پێویستە ئاوڕ لە هەوڵەکانی کاک وریا دیوانی بدەمەوە کە لە قۆناغە سەرەتاییەکانی ئەم توێژینەوەیەدا ئەرکی تایپ کردنی زاراوەکانی لە ئەستۆ گرت. بێجگە لەم بەڕێزانەش، کاک شەهاب نەدیمی، کاک ساجد حسێنی و کاک سامان زلێخایی کە بە شێوەگەلی جیاجیا هاوکاریی زۆریان نواند لە بەرەوپێشچوونی ئەم کارەدا و بەشێکی تری زاراوە ئینگلیزییەکانیان تایپ کرد. هەروەهاش، سپاسی خۆم پێشکەشی خاتوو حەسیبە سەیدی دەکەم کە لە ڕووی دابین کردنی سەرچاوەکانەوە زۆری یارمەتی دام. سپاس و پێزانینیشم هەیە بۆ بەڕێز سۆران عەزیز بەرپرسی ماڵی وەفایی لە هەولێر کە بە پیر داواکەی منەوە هات و سەرپەرشتیی ئەرکی پەڕبەندی و بەرگسازی و چاپەکەی کرد.

## دوا وتە

هیوادارم لە لایەن دەزگا و دامەزراوە پێوەندیدارەکان و زانکۆکانی کوردستانەوە گرنگیی زیاتر بدرێ بە ئەرکی گەورە و گرنگی وشەڕۆنان و زاراوەسازی و بەرپرسانی ئەو ناوەندانە بە هەستیاریی زیاترەوە ڕووبەڕووی ئەم پرسە ببنەوە. هیوادارم لە بەشی توێژینەوەیی زمانناسی و ئەدەبی کوردیی توێژینگەی کوردستانناسیی زانکۆی کوردستاندا لێژنەی زاراوەسازی دابمەزرێ و دەست بە کارەکانی بکات. بەداخەوە، هەندێ ناوەندی پێوەندیدار لە ناوەوە و دەرەوە بایەخی ئەوتۆیان نەداوەتە ئەم ئەرکە گرانە و زیاتر خۆیان بە بابەتی ترەوە خەریک کردووە. هیوادارم لێژنەی زاراوەسازیی ئەکادێمیای کوردی لە هەولێر چالاکتر لە ڕابردوو بایەخ بەم بوارە بدات.

هیوادارم لە باکووری کوردستان ناوەندێک بۆ ئەم پرسە زیندە گرنگە دابمەزرێ. هیوادارم ناوەندەکانی بڵاوکردنەوەی کتێب و گۆڤار و بەڕێوەبەرانی ڕاگەیاندن و ماڵپەڕەکان بە جیدی و بە پارێزەوە زاراوەکان بەکار بهێنن.

پێم وابێ هەمووان لەسەر گرنگایەتی و بایەخی دانانی وەها ناوەند و لێژنەیەک تەبا و هاودەنگن. ئەندامانی ئەو لێژنەیەش — لە هەر شوێنێک دابمەزرێت — پێویستە بێجگە لە زانینی زمانی کوردی و هەموو یان زۆربەی زارە کوردییەکان هاوکات چەندین زمانی تریش بزانن، بە تایبەت زمانە ڕۆژئاواییەکان. ئەندامانی ئەو لێژنەیە پێویستە بە وردی ئاگاداری ڕەچەڵەکناسی و کۆنینەناسیی وشەکان بن و شارەزای ڕەوت و ڕێسای وشەڕۆنان و زاراوەسازی بن و لە پێناوی پەرەسەندنی زمانی کوردی بە تایبەت لە دەڤەری وشەڕۆنان و زاراوەسازیدا شێلگیرانە کار بکەن. هەر کەسێ دەیەوێ لەم بوارەدا کار بکات و یاخود حەزی لە بابەتەکەیە، پێویستە وێڕای ئەو تایبەتمەندیانەی سەرەوە، ئاگاداری مۆرکە زمانییەکان و ڕێسا زمانناسانەکان بێت، نەخاسما هەموو بەشەکانی ئاخاوتن، جۆرەکانی ئامراز و گیرەک، ڕێساکانی وشەسازی، جیاوازیی نێوان وشە و مۆرفیم و پرسە پێوەندیدارەکانی تر. هەروەتر، ئەبێ لە لایەن دەسەڵاتەوە جێگە و پێگەیەکی فەرمی ببەخشرێتەوە ئەو ناوەندانە و لایەنگەلی یاسادانەر و جێبەجێکاریش، واتە پەرلەمان و حکومەت، پێویستە بە جیدی بەدواداچوون بۆ کارەکە بکەن.

هیوادارم ئەم هەوڵەی بەردەست هەندێ کەلێنی بواری زاراوەسازی لە دەڤەری زانستە مرۆییەکاندا و بە تایبەت لە بواری ڕەخنە و تیۆریی ئەدەبی و فەرهەنگیدا پڕبکاتەوە و تۆزە ڕووناکییەک ببەخشێتە قوژبنە تاریکەکانی ئەم ئاقارە لە کتێبخانەی کوردیدا. بەو هیوایەی ببین بە خاوەنی زمانێکی پاراو و یەکگرتوو بۆ نووسین و وەرگێڕانی دەقە زانستی و تیۆریکەکان. هیوادارم توێژەری کوردینووس کات و وزەی خۆی بۆ بابەتی بەرباسی توێژینەوەکەی تەرخان بکات و چیدی ناچار نەبێت کات بۆ زاراوەسازییش دابنێت. ئەم پێشنیازانەش لەم فەرهەنگەدا پێشکەش کراون دواقسە و دوابڕیار نین و بێ‌گومان کەموکوڕییان تێدایە. بۆیەش تکایە سەرنجەکانی خۆتان سەبارەت بە هاوواتای زاراوەکان، بە کوردیی ناوەندی و سەروو و بە فارسیشەوە، بنێرن بۆم.

**بەختیار سەجادی**

**زانکۆی کوردستان، سنە**

**بەفرانباری ١٤٠٠ی هەتاوی (٢٠٢١ی زایینی)**

# پەنجا خاڵ
## لەسەر زاراوەسازی و وەرگێڕانی چەمکەکان

### 1. جواننناسی یان جوانیناسی؟

لە کوردیدا بۆ زانستی aesthetics جوانناسی و جوانیناسی بەکار دەهێنرێت. پێویستە بڵێین کە جوانناسی بۆ ئەم مەبەستە و لەم بەستێنەدا هەڵەیە و جوانیناسی دروستە. هەر ئەم بەکارهێنانە هەڵەیە لە زمانی فارسیشدا و لە سەر دەستی کۆمەڵێ نووسەر و وەرگێڕی ناشارەزای فارس دەبینرێ و لە جیاتی «زیبائی‌شناسی» دەنووسن «زیباشناسی». جوانناسی وشەیەکی هەڵە نییە بەڵام ئەگەر مەبەست ئەو زانستەیە کە باسی جوانی، تایبەتمەندییەکانی و جۆرەکانی دەکا ئەبێ بڵێین جوانیناسی، چونکە لە هەندێ بەرهەم و لقی ئەدەبی و هونەریدا، بە تایبەت ئەدەب و هونەری مۆدێرن، لەوانەیە جوانی دەلالەت نەکاتە سەر بابەت یان شتی جوان. لێکۆڵینەوەی هۆکاری هەڵەبوونی بەکارهێنانی جوانناسی لە کوردیدا یان زیباشناسی لە فارسیدا لەبری جوانیناسی باسێکی دوورودرێژ هەڵدەگرێ. ئەم زانستە لە پێناسە و چۆنیەتیی دەرکەوتنی جوانی و تایبەتمەندی و جۆرەکانی جوانی دەکۆڵێتەوە و ئەم باسانەش پێوەندییان بە شت یان بابەت و دیاردەی جوانەوە نییە. زۆر جار، بە تایبەت لە ئەدەب و هونەری مۆدێرندا، بابەت و دیاردەی دزێو و ناشیرین و تەنانەت پیسیش بۆخۆی بەشێکە لە چوارچێوەی جوانیناسانەی بەرهەمەکە. ئەگەر لە ئەدەب و هونەری کۆندا ئەمە تەنها جوانە کە جوانیی تێدایە و جوانی دەنوێنێتەوە، لە ئەدەب و هونەری مۆدێرندا هەندێ جار بابەتی دزێو و ناشیرینیش جۆرێک جوانیی هونەری و ئەدەبی دەبەخشێتە بەرهەمەکە. باسکردن لەم جیاوازییە پێوەندیی ڕاستەوخۆی بە جیاوازیی نێوان

جوانیناسیی کلاسیک و جوانیناسیی مۆدێرنەوە هەیە و دیارە ئێرە شوێنی ئەو باسە نییە، بەڵام تەنها بۆ لێکۆڵینەوەی زیاتر خوێنەر دەتوانێ بەرهەمەکانی شاعیری گەورەی فەرەنسی شارڵ بوودلێر و ڕاڤەی واڵتێر بێنیامین بۆ ئەو شیعرانە و یان تیۆرییەکانی بیرمەندی ئیتاڵی، بێنێدێتۆ کرۆچە، لەسەر جوانیناسی بخوێنێتەوە.

## ٢. ئەفسانە یان ئوستوورە؟

ئەفسانە و ئوستوورە نەک هەر یەکێک نین، بەڵکوو تەنانەت جیاوازیی زۆریشیان لە نێواندایە، کەچی وەک دەبینین زۆر جار هەندێ نووسەر و وەرگێڕی کورد نەک هەر لە جیاتی یەک بەکاریان دەبەن، بەڵکوو ڕێک بە پێچەوانەشەوە بەکاریان ئەهێنین. ئەفسانە (legend) چیرۆکێکە هەم ماکی واقیعی تێدایە و هەم هێمانی خەیاڵکرد. ئەفسانە چوارچێوەیەکی دیاریکراوی نییە و لەوانەشە هەر ئێستا لەم سەردەمەی ئێمەدا سەدان ئەفسانە سەبارەت بە کەسایەتی و دیاردە جیاجیاکان سازبکرێ. بەڵام، ئوستوورە (myth) ئەگەرچی بە تەواوی خەیاڵکردە، هاوکات هەڵگری چوارچێوەیەکی دیاریکراویشە و جۆرێکە لە خوێندنەوەی جیهان و سروشت لە لایەن مرۆڤی سەردەمی ئوستوورەوە. بێجگە لەمەش، لە بەشە جیاجیاکانی ئوستوورەدا، بە پێچەوانەی ئەفسانەوە، یەکگرتوویەکی مانایی دەبیندرێت و ئوستوورە ڕێسامەندە و خاوەنی هۆدارێتییە، واتە پێوەندیی هۆکار و هۆکردیی تێدایە. ئوستوورە بەو مانایەی کە لێرە لە هەمبەر ئەفسانەدا ڕەچاوی دەکەین سەردەمی خولقاندنی بەسەرچووە. ئەگەرچی ڕەخنەگرێکی وەک ڕۆڵان بارت باس لە ئوستوورە هاوچەرخەکان و چۆنیەتیی سازبوونیان دەکات، بەڵام لێرەدا مەبەستی من ئوستوورەکانی سەردەمی کەونارایە کە بە شێوەیەک دەرئەنجامی هەوڵی مرۆڤی ئەو سەردەمە بوو بۆ دەستەبەرکردنی خوێندنەوەیەکی عەقڵانیی بۆ جیهان و بە تایبەت مێکانیزمە سروشتییەکان. باشترین سەرچاوە بۆ ئاگاداربوون لەم دەورەی ئوستوورە خوێندنەوەی بەرهەمی فیلسووفانی قوتابخانەی فرانکفۆرت و بە تایبەت ئادۆرنۆ و هۆرکهایمێر-ە. سەیر لەوەدایە من لە زمانی کوردیدا کەسی وا دەناسم کە بەرهەمی لە قوتابخانەی فرانکفۆرتەوە کردووە بە کوردی و کەچی لەبری ئوستوورە کە مەبەستی نووسینەکەیەتی «ئەفسانە»ی داناوە. تەنانەت لە زمانی فارسیشدا وەرگێڕێکی بەناوبانگ و توانا وەک نەجەف دەریابەندەری هەر ئەم هەڵەیەی کردووە و ئوستوورەی بە ئەفسانە داناوە. ئەگەرچی ئەو پێ لە سەر ئەم بۆچوونەی خۆی دادەگرێ

و تەنانەت کتێبێکیشی لە سەر ئەم بابەتە نووسیوە، بەڵام ئێمە بە گشتی پێمان وایە وەرگێڕانی mythبۆ ئەفسانە هەڵەیە و یەکسەر لە واتای ڕاستەقینەی ئەم زاراوەیە دوورمان دەخاتەوە.

### ٣. گرفتی وەرگێڕانی the لە هەندێ زاراوەدا

لە زمانگەلی فەرەنسی و ئینگلیزیدا ئاوەڵناو بە تەنیایی و بەبێ ناو و یاخود بەبێ ئامرازە جیاجیاکانی دەستنیشانکردنی دەلالەت بەکار ناهێنرێت. بەڵام، لە دەقە تیۆریک و فەلسەفییەکاندا هەندێ جار چاومان بە کۆمەڵێ زاراوە دەکەوێ کە پێکهاتوون لە the و ئاوەڵناوێک. خوێنەری ئەو دەقانە لەوانەیە لەخۆڕا بە دوای ناوێکدا بگەڕێ کە ئەو ئاوەڵناوە دەلالەت دەکاتە سەری، بەڵام ئەبێ ئەوە بزانین کە لێرەدا ناوێک لە گۆڕێدا نییە و ئەو دەستەواژەیە بۆخۆی زاراوەیەکی سەربەخۆیە. چەند نموونەیەک لە ئینگلیزی و فەرەنسیدا بریتین لە:

the particular, the universal, the social, le social, la politique

گرفتی وەرگێڕانی ئەم تاقمە زاراوانە لە هەر دوو زمانی فارسی و کوردیدا بە تەواوی هەست پێدەکرێت. ئەگەر بە تەنها بنووسین «اقتصادی» یان «ئابووریی»، ئەوا هەر دووکیان ئاوەڵناون و کەواتە سەربەخۆ نین. ئەگەر هەر بە هەمان شێوە وەربگێڕدرێنەوە، لە لایەکەوە ڕێزمانی ڕستەکە تێکدەدەن و، لە لایەکی تریشەوە، واتاکە لێڵ دەکەن. هەر بۆیەش، لەم جۆرە کاتانەدا و بە مەبەستی وەرگێڕانیان بۆ هەر دوو زمانی فارسی و کوردی باشتر وایە ناوێکیان بخەینە سەر تا لەو گرفتانەی سەرەوە خۆمان دەرباز بکەین. کەواتە، ئەو زاراوە ئینگلیزی و فەرەنسییانەی سەرەوە پێویستە بەم شێوەیەی خوارەوە لە فارسی و کوردیدا بێنە وەرگێڕان:

لە فارسیدا: امر جزئی، امر کلی، امر جهان‌شمول، امر اجتماعی، امر اقتصادی

لە کوردیدا: بابەتی تایبەتی، بابەتی گشتی، بابەتی جیهانگرەوە (یان، بابەتی دنیاداگر)، بابەتی کۆمەڵایەتی، بابەتی ئابووریی.

## ٤. سێ دەڤەرەکەی لاکان

لە وەرگێڕانی سێ چەمکە فرەپاتەکەی بۆچوونی دەروونشیکارانەی لاکانیدا دەتوانین کەڵک لە بابەت، دەڤەر و تەنانەت ئاست-یش وەربگرین و بەم شێوەیە تەرجەمەیان بکەین:

The real امر واقعی، دەڤەری واقیعی، بابەتی واقیعی

The symbolic امر نمادین، دەڤەری هێمایین، بابەتی هێمایین

The imaginary امر خیالی، دەڤەری خەیاڵکرد، بابەتی خەیاڵکرد

خاڵێکی تری هاوپەیوەند بەم باسەوە جیاوازیی بنەڕەتیی نێوان دو زاراوەی «امر واقع» و «امر واقعی»یە. واتە، بابەتی واقیع بە تەواوی لە بابەتی واقیعی جیایە. لە سەرەوە ئاماژەم بۆ بابەتی واقیعی کرد و گوتم کە زیاتر لە بۆچوونی دەروونشیکارانەی لاکانیدا دێتە بەکارهێنان. بەڵام، بابەتی واقیع لە ڕاستیدا وەرگێڕانی وشەی factی ئینگلیزییە. لە زمانی ئینگلیزیدا هیچ جۆرە وێکچوونییەک لە نێوان ئەم وشەیە و وشەکانی تری بەرباسی ئەم یاداشتەدا لە ئارادا نییە و لێرەشدا هەر تەنها لەبەر ئەوە ئاماژەم بۆ کرد کە جیاوازیی زەقوزۆپی نێوان بابەتی واقیع و بابەتی واقیعی دەرخەم؛ ئەمەش ئەو جیاوازییەیە کە ڕەخنەگر و وەرگێڕی کورد بەداخەوە کەمتر سەرنجیان دەداتێ.

## ٥. نووسینی تیۆری و نووسینی تیۆریک

هۆکاری بە کارهێنانی «تیۆری» لەبری «تیۆریک» بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەندێ نووسەری کورد لە زاراوەی «تیۆر» کەڵک وەردەگرن بە مەبەستی ئاماژەکردن بۆ «تیۆری». ئەمە بە تەواوی هەڵەیە و یەکێکی ترە لە ئاکامە نەرێنییەکانی کاریگەریی زمانی عەرەبی لەسەر هەندێ نووسەری کورد. بۆ نموونە، زۆر کەس مەبەستیان لە «نووسینی تیۆری» نووسینی تیۆریکە. ئەگەر «نووسینی تیۆری» بۆ فارسی وەربگێڕین، دەبێتە «نوشتن نظریه»، کەچی مەبەست «نوشتار نظری»-یە کە لە کوردیدا دەبێتە نووسینی تیۆریک. «تێئۆریک» فەرەنسییە نەک ئینگلیزی و لە ئینگلیزیدا بە شێوەی «تێۆرێتیکاڵ» بە کار دەبرێ. «تیۆریک» وەک فۆرمی سادەکراوی «تێئۆریک» لە دەربڕیندا دروستە. هەڵبەت ئەم سادەبژێرییە زۆر لەو ساکارکردنەوەیە دوورە کە پێشتر لە هەندێ نووسیندا وەک تایبەتمەندیی سابجێکتیڤیتیی نەریتی

و سەلەفی ناوم لێبردووە و پێوەندیی بەم باسەی بەردەستەوە نییە. هەر بە هەمان شێوەش، بەکارهێنانی «تیۆر» هەڵەیە و کەس نازانێ بۆچی هەندێ نووسەر و وەرگێڕی کورد ئەم زاراوەیە بەم شێوەیە بە کار ئەبەن. هەرچەند لە زمانی عەرەبیدا دەنووسرێ تیۆر، بەڵام ئەوانیش بە هەڵە بەکاری ئەهێنن. لە جیاتی تیۆر کە هیچ جۆرە پاساوێکی زمانناسانە و عەقڵانیی بۆ نییە ئەبێ بنووسین تێئۆری یان تیۆری.

## ٦. کلاسیک یان کلاسیکی؟ ڕۆمانتیک یان ڕۆمانتیکی؟

هەڵەیە گەر «ی»ی ئاوەڵناوسازکەر بخەینە سەر کۆمەڵە وشەیەک وەک ڕۆمانتیک، دێمۆکراتیک و ئەکادێمیک، چونکە ئەم وشانە بۆخۆیان پێشوەخت ئاوەڵناون. کەواتە لە جیاتی دێمۆکراتی پێویستە بنووسین دێمۆکراتیک و لە بری ڕۆمانتیکی ئەبێ بنووسرێ ڕۆمانتیک. بەکارهێنانی ئەم زاراوانە بەم شێوەیەی خوارەوە هەڵەیە:

ڕۆمانتیکی، ئایدیۆلۆجیکی، ئاکادیمیکی، ئاکادیمی (لە پێگەی ئاوەڵناودا)، ستراتێژی (فەرەنسی و لە پێگەی ئاوەڵناودا)، ستراتێژیکی، ستراتێجی (ئینگلیزی و لە پێگەی ئاوەڵناودا)، ستراتێجیکی

یەکێک لە هۆکارەکانی ئەم شێوە بەکارهێنانە دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەریی زمانی عەرەبی لە سەر هەندێ نووسەر و وەرگێڕ کە زیاتر لە باشووری کوردستاندا پەروەردە بوونە و زیاتر بە عەرەبی دەخوێننەوە، چونکە لە زمانی عەرەبیشدا بەکارهێنانی ئەم وشە و زاراوانە هەر بە هەمان شێوەیە. هۆکارێکی تری نووسینی ئەم وشانە بەو شێوەیەی سەرەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئاگادارنەبوون لەو ڕاستییەی کە ئەم وشانە بۆخۆیان ئاوەڵناون. بە پێچەوانەوە، زۆر جار دەبینین زاراوەیەک کە بۆخۆی ناوە لە پێگەی ئاوەڵناودا بە کار دەبرێت. بۆ نموونە، ستراتێژی (فەرەنسی) یان ستراتێجی (ئینگلیزی) ناوە، بەڵام چونکە وا دەزانرێ ناوەکەی بە شێوەی «ستراتیژ» بەکار دەبرێ، ستراتێژی وەک ئاوەڵناو بەکار دەهێنرێ. ڕێککەوتنی ستراتێژیک یان ستراتێجیک دروستە نەک ڕێککەوتنی ستراتێژی. پێوەندییە دیپلۆماتیکەکان دروستە نەک پێوەندییە دیپلۆماسییەکان. لە زمانی فەرەنسی و ئینگلیزیدا هەندێ جار ئەو ئاوەڵناوانەی بە پاشگری «یک»ەوە کۆتاییان پێ دێ بە دوو شێوەی جیاواز دەردەکەون وەک classic و classical .

هەر دوو زاراوەی ئایدیۆلۆجیک ideologic و ئایدیۆلۆجیکی ideological بەو شێوەیەن. دەتوانین بۆ یەکەمیان کلاسیک و بۆ دووەمیان کلاسیکی بەکار بهێنین. هەڵبەت لە بیرمان نەچێ ئەگەر وشەی «کلاسیک» لە هەندێ ڕستەدا لە پێگەی ناودا (واتە، ئاوەڵناوی جێگری ناو) دەرکەوت، پێویستە لە وەرگێڕانیدا بۆ سەر زمانی کوردی یان بە تەنها دابنرێ و یان کۆمەڵە وشەیەکی وەک بەرهەم، شاکار، فیلم، وێنە، یان وشەی تری لەم چەشنەی بخرێتە سەر کە پێوەندییان بە ناوەرۆکی ڕستەکەوە هەیە:

*Hamlet* is a classic in world literature.

*هەملێت* بەرهەمێکی کلاسیکە لە ئەدەبی جیهاندا.

*هەملێت* شانۆنامەیەکی کلاسیکی ئەدەبی جیهانە.

*هەملێت* دەقێکی کلاسیکی ئەدەبی جیهانە.

*هەملێت* لە ئەدەبی جیهاندا کلاسیکە.

### ٧. پاشگری «یک»

لەو زمانانەی ڕەگیان لە ناو لاتیندایە، وەک فەرەنسی و ئینگلیزی، پاشگری «یک» ئاوەڵناوسازکەرە وەک ئایدیۆلۆجیک یان ڕۆمانتیک کە ئاوەڵناوی ئایدیۆلۆجی و ڕۆمانسن. لێرەدا لەوانەیە چەند خوێنەرێک خێرا تووشی واقوڕمان بن و بڵێن یاساوڕێسای ڕێزمانناسانەی ئەو زمانانە چ پێوەندییەکیان بە زمانی کوردییەوە هەیە. کۆمەڵێ نووسەر و وەرگێڕ لە زمانی فارسیدا، وەک داریووش ئاشووری و بابەک ئەحمەدی، وای بۆ دەچن کە ئەم پاشگرە لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا بەکار هێنراوە و هەر بۆیەش لە نووسراوەکانیاندا لە ئاوەڵناوی، بۆ نموونە، «زبانشناسیک» کەڵک وەردەگرن. تەنها کەسێک کە لە زمانی کوردیدا تۆزەک لەم ڕاستییە نزیک بۆتەوە مامۆستا مەسعود محەمەد-ە کە وای بۆ دەچێ کە پاشگری «یک» لە کوردیشدا ئاوەڵناوی پێدروستدەکرێ. مەسعوود محەمەد (بە بێ ئاگاداربوون لە ڕوانگەی ئەو دوو نووسەرە فارسەی سەرەوە) لە *زاراوەناسی پێوانە*دا پێی وایە کە لە کوردیشدا ئەکرێ لەم پاشگرە بۆ سازکردنی ئاوەڵناو سوود وەربگرین. ئەو نموونەیەش کە دەیهێنێتەوە وشەی «پەلیک»-ە کە پێی وایە هەمان پەلکراوە (پەلیک ئەو دارە پەلکراوەیە کە منداڵان لە یارییەکی کۆنی کوردەواریدا بەکاری دەهێنن).

بە مەبەستی دانانی ئاوەڵناو بۆ کۆمەڵە ناوێک وەک زماننناسی و کۆمەڵناسی دەتوانرێ کەڵک لە زماننناسانە، زماننناسیانە، زماننناسیک و کۆمەڵناسانە، کۆمەڵناسیانە و کۆمەڵناسیک وەربگیردرێ. هەرچەندە، من و چەند هاوڕێیەکم سەرەتا چەمککگەلی زماننناسەکی و کۆمەڵناسەکی-شمان وەک ئاوەڵناو بەکار دەهێنا و بەڵگەکەشمان کۆمەڵە ئاوەڵناوێکی تر بوو وەک دەشتەکی، گوندەکی، دەرەکی و هتد. بە کورتی، لە فارسیدا بو دروستکردنی ئاوەڵناوی زاراوەیەکی وەک «روانشناسی» سێ ڕێگەمان لەبەردەستدایە کە دەبنە «روانشناسانە»، «رەوانشناختی» و «روانشناسیک». لە کوردیشدا، چوار ڕێگەمان هەیە کە ئەنجامەکانیان دەبنە دەروونناسانە، دەروونناسیانە، دەروونناسیک و دەروونناسەکی. ئێستا لە نووسینی کوردیدا بە شێوەیەکی گشتی لە دەروونناسانە، زماننناسانە و کۆمەڵناسانە کەڵک وەردەگرین تا نموونەکانی تر.

### ٨. پیشەسازی و پیشەسازانە

زۆربەی نووسەران و وەرگێڕان جیاوازیی نێوان پیشەسازی و پیشەسازانە ڕەچاو ناکەن. پیشەسازی ناوە و پیشەسازانە ئاوەڵناو. لە نووسینی کوردیدا بە دەگمەن پیشەسازانە بەکار دەبرێ و لەبری ئەوە دەنووسرێ پیشەسازی. گەر industry بە پیشەسازی تەرجەمە دەکەینەوە، پێویستە industrial بە پیشەسازنە دابنرێ. لە کوردیدا هەمووان کەڵک لە دەستەواژەی شۆڕشی پیشەسازی وردەگرن کە هەڵەیەکی باوە، چونکە دروستەکە دەبێتە شۆڕشی پیشەسازانە؛ لەبەر ئەوەی مەبەست «انقلاب صنعتی» نەک «انقلاب صنعت». لە ئینگلیزی و زۆر زمانی تریشدا ئەم جیاوازییە ڕەچاو کراوە.

### ٩. سۆسیۆلۆژی، سۆسیۆلۆجی، سۆسیۆلۆژیا، یان کۆمەڵناسی؟

پێویست ناکا کۆمەڵێ چەمک و زاراوەی دژوار و نامۆ و بیانی کە دەکرێ بە ڕوونی و ڕەوانی بۆ کوردی وەربگێڕدرێن هەر بە هەمان شێوە لاتینییەکەیان بنووسرێنەوە. پێویستە لەبری ئەو زاراوە ڕەقوتەق و نامۆیانەی خوارەوە بەرامبەرەکانیان دابندرێ:

ئەپەستەمۆلۆجیا، ئێپیستیمۆلۆجی، ئێپیستێمۆلۆژی: **مەعریفەناسی** (زانیاریناسی هەڵەیە چونکە لە کوردیدا زانیاری بە تەواوی مانای مەعریفە ناگەیێنیٚ.)

سۆسیۆلۆجیا، سۆسیۆلۆجی، سۆسیۆلۆژی: **کۆمەڵناسی**

سایکۆلۆجیا، سایکۆلۆجی، پسیکۆلۆژی: **دەروونناسی**

ئۆریەنتالیزم: **ڕۆژهەڵاتناسی**

سیمۆلۆجیا، سێمیۆلۆجی: **نیشانەناسی**

ئیستەتیکس، ئیستێتیکس: **جوانیناسی**

بایۆلۆجیا، بایۆلۆجی، بیۆلۆژی: **زیندەوەرناسی**

هەندێ جار بە تایبەت لە وەرگێڕانی ناوی هەندێ ڕێبازی ئەدەبی و فیکریدا باشتر وایە وشەکە وەرنەگێڕدرێ، وەک فۆرمالیزم لەجیاتی شێوەخوازی یان ڕوخسارخوازی، یان قوتابخانەی لیبرالیزم، نەک قوتابخانەی ئازادیخوازی. ئازادیخوازی لە کوردیدا وەکوو چەمک بەکار دێ، بەڵام دانانی بۆ قوتابخانەی لیبرالیزم هەڵەیە چونکە ئەمڕۆکە ئەم ناوە بۆتە ناوێکی تایبەت. زۆر بە لامەوە سەیرە لەبەرچی هەندێ نووسەری کورد زاراوەیەکی وەک «ئیپۆک» بە کار ئەهێنن؟ ئیپۆک وشەیەکی ئینگلیزییە بە مانای سەردەم. یان، بۆچی هەر ئەم نووسەرانە لەبری ئاسۆ دەنووسن هۆریزۆن؟! بۆچی هەندێ قەڵەمبەدەستی کورد کەڵک لە زاراوەگەلێک وەردەگرن کە نەوەد لە سەدی خوێنەرانیان نازانن ماناکەیان چییە؟ کەچی هاوواتای هەر هەمان وشە لە کوردیشدا هەیە. سەیر لەوەدایە ئەم جۆرە چەمکانە، زاراوەیەکی تیۆریکی قورس و گران نین کە نووسەر نەزانێ لە کوردیدا چ هاوواتایەکیان بۆ دابنێ. ئیپۆک و هۆریزۆن دو چەمکی گشتین و دەکرێ زۆر بە ئاسانی بکرێن بە سەردەم و ئاسۆ. وەک چەندین جار بە هێنانەوەی هەندێ نموونە پیشانم داوە، زۆربەی نووسەران و وەرگێڕانی کورد هۆشیاریی زمانناسانەیان نییە و ئەمەش وای کردووە کە بەرهەمی ئەو نووسەرانە هەڵگری گەلێک کێشەی شێوازناسانە بن.

## ١٠. هاوکێشه یان هاوکێش؟

زۆربەی کاتەکان وا دەزانرێ زاراوەی هاوکێشە پێوەندیی بە «کێشە»وە هەیە، کەچی لێرەدا مەبەست «کێش»ە. شێوەی دروستی زاراوەکە هاوکێش-ە بەڵام باوە وەک هاوکێشە بەکار ئەبرێ. ئەم جۆرە نموونانە بە هۆی جیاوازیی زۆر بچووکی نێوانیانەوە و لەبەر کەمتەرخەمیی دانەر یان نەبوونی هۆشیاری زمانناسانە لەبری یەکتر بەکار ئەهێنرێن. ڕێکخراو organized جیاوازە لە ڕێکخراوە organization، چ لە باری وشەسازییەوە و چ لە ڕووی ماناییەوە، وەک چۆن دامەزراو لە دامەزراوە جیاوازە.

## ١١. ناسی یان زانی؟

بەکارهێنانی «ناسی» و «زانی» بۆ دەستنیشانکردنی لقە جیاجیا زانستییەکان (وەک زیندەوەرناسی و زیندەوەرزانی) ڕاستە، بەڵام چەند سەرنجێک پێویستە. ڕەنگە سەرەتا «زانی» بە دروستتر بزانین چونکە لە کوردیدا زانین مانای ناسین-یش دەگرێتەوە، کەچی ناسین مانای زانین ناگرێتەوە. کە دەڵێین ئەو برادەرە دەناسم، بەو مانایە نییە کە بە تەواوەتی و بە باشی دەزانم کێیە و خەریکی چییە. ئەم تایبەتمەندییە لە ئینگلیزیدا نابیندرێ و کرداری to know بۆ هەر دوو واتاکە بەکار دەبرێ. بەڵام لەبەر ئەوەی کە ناسین لە هەناوی خۆیدا هەڵگری بارێکی مەعریفیشە و لەبەر ئەوەش کە بەبێ گرفت بە پاشگری جیاجیاوە دەردەکەوێ و ئەم خەسڵەتەس کەمتر لە زانی-دا هەیە (وەک دەروونزانانە و دەروونناسانە) و هەروەها پاشگری لۆگی بە مانای ناسین و مەعریفەیە نەک زانین و، بێجگە لەمەش، ناسی لە هەندێ زانستدا هێندە جێکەوتووە کە کاتێ بە زانی-یەوە بیاننووسین دەبنە زاراوەیەکی نامۆ (وەک جوانیزانی لە بری جوانیناسی)؛ کەواتە، بە مەبەستی یەکدەستکردنی زمانی زانستیی کوردی باشتر وایە لە هەموو زانستەکاندا لە جیاتی پاشگری زانی لە ناسی کەڵک وەربگیردرێ. لە زمانی فارسیدا زۆر بە وردی و بە دروستی جیاوازیی نێوان زانی و ناسی دانراوە؛ ئەمەش لەو دوو زاراوەی «کاردان» و «کارشناس»دا دەردەکەوێ.

زیندەوەرناسی (زیندەوەرناس، زیندەوەرناسانە) biology
دەروونناسی (دەروونناس، دەروونناسانە) psychology
کۆمەڵناسی (کۆمەڵناس، کۆمەڵناسانە) sociology
مرۆڤناسی (مرۆڤناس، مرۆڤناسانە) anthropology
مەعریفەناسی (مەعریفەناس، مەعریفەناسانە) epistemology
دێرینەناسی (دێرینەناس، دێرینەناسانە) archaeology
رەچەڵەکناسی (رەچەڵەکناس، ڕەچەڵەکناسانە) genealogy

## ١٣. فێرکارانە، پیشەسازانە، شیکارانە

چەندین جار لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بینیومە کەڵک لە دەستەواژەی «ڕاپۆرتی شیکاری» وەردەگیردرێ. بە ڕاستی ئەوان مەبەستیان «راپۆرتی شیکارانە»-یە. شیکاری لە ڕووی ڕێزمانییەوە ناوە و شیکارانە ئاوەڵناو. هەر بۆیە، ڕاپۆرتی شیکاری دەبێتە «گزارش تحلیل» کە دیارە ئەوان مەبەستیان «گزارش تحلیلی»یە کە دەبێتە «راپۆرتی شیکارانە». هەر لەسەر ئەم ڕێڕەوە، وشەی پیشەسازی ناوە و ئەگەر بمانەوێ لە کوردیدا ئاوەڵناوی بۆ ساز بکەین، دەتوانین کەڵک لە پیشەسازانە وەربگرین. دەستەواژەی «انقلاب صنعتی» لە کوردیدا دەبێتە شۆڕشی پیشەسازانە، کەچی ئەمڕۆکە ئەم دەستەواژەیە بە شێوەیەکی نادروست و لەسەر دەستی زۆرێک لە نووسەران و وەرگێڕانی کورد بە شێوەی «شۆڕشی پیشەسازی» دێتە بەکارهێنان کە بە مانای «انقلاب صنعت»-ە نەک «انقلاب صنعتی». لە ئینگلیزیشدا هەر بە هەمان شێوەیە و ئاوەڵناوی industrial بەکار دەبرێ نەک ناوی industry. زۆر جار بینیومە کە لە جیاتی ئاوەڵناوی فێرکارانە ناوی فێرکاری بەکار دەبرێ؛ یان، لەجیاتی کۆنفرانسی فێرکارانە و وانەی فێرکارانە بە شێوەیەکی نادروست دەنووسرێ کۆنفرانسی فێرکاری و وانەی فێرکاری. نموونەی زەق زانکۆی فێرکارییە!

## ١٣. ڕەچاوکردنی مۆرکەکانی ڕستەسازی

پێشتریش وتوومانە و پێویستە لێرە دووبارەی بکەینەوە کە زمانی کوردی خاوەنی کۆمەڵێ مۆرک و تایبەتمەندییە کە ئەبێ لە وەرگێڕان و یاخود لە وشەڕۆنان و زاراوەسازیدا ڕەچاو بکرێن. لە کوردیدا چەندین جۆری جیاوازی وشەسازی و کۆوشەسازی لە ئارادان و گەر ڕەچاو نەکرێن ڕەسەنایەتیی بەرهەمەکە تێک‌دەدەن. ئەم دەستەواژانەی خوارەوەم پێشتر وەک نموونە هێناوەتەوە:

قوتابخانەی مەحوی سەرەتایی لەبری قوتابخانەی سەرەتایی مەحوی

فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتیی هەولێر لەبری فڕۆکەخانەی هەولێری نێودەوڵەتی

زانکۆی پزیشکیی هەولێر لەبری زانکۆی هەولێری پزیشکی

## ١٤. زاراوەی «باسکار»

یەکەم جار زاراوەی «باسکار»م لە گۆڤاری *ڕەهەند*دا بینی. پاشان گۆڤارێکم بە دەست کەوت بە ناوی *باسکار* کە چەندین ساڵ پێش ئێستا لە سلێمانی دەردەچوو. لە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەمان لەگەڵ ئەم زاراوەیەدا لەوانەیە وا بزانین مەبەست لەم زاراوەیە ئەو کەسەیە کە کاری باسکردنە و لە سەر دیاردە جیاجیاکان باس دەکات. بەڵام، لە بیرمان نەچێ کە ئەو کەسانەی ئەم زاراوەیە بەکار ئەهێنن مەبەستیان ئەو کەسەیە کە کاری توێژینەوە و لێکۆڵینەوەیە، چونکە ئەوان ئەم زاراوەیەیان لە «باحث»ی عەرەبییەوە وەرگرتووە. ئەگەرچی وشەی «باس» لە کوردیدا لە «بحث»ی عەرەبییەوە وەرگیراوە، بەڵام لە زمانی کوردیدا ماناکەی بە تەواوی گۆڕدراوە. لە کاتێکدا کە لە زمانی عەرەبیدا ئەم زاراوەیە بە مانای لێکۆڵینەوە دێتە بەکارهێنان، لە زمانی کوردیدا مانای لێکۆڵینەوە ناگەیێنێت و ئەم جیاوازییەش ئەوەندە زۆرە کە لە کوردیدا زاراوەی قسەوباس-ی لێ دروستکراوە، وەک چۆن دەوترێ قسەوباسی ژنانە. باسکار ئەگەر بە مانای ئەو کەسەیە کە خەریکی باس‌کردنە یان کاروباری باس‌کردنە ڕاستە، بەڵام لە هەر دوو نموونەکەی سەرەوە (*ڕەهەند* و *باسکار*) ئەم زاراوەیە بە مانای لێکۆڵەرەوە، لێکۆڵیار یان توێژەر بەکار براوە. کەواتە، بەکارهێنانی زاراوەی «باسکار» بۆ «باحث»ی عەرەبی هەڵەیە. ئەم نموونەیە ئەوەمان بۆ دەردەخا کە بەداخەوە زۆربەی نووسەرە دیارەکانی کورد بەبێ سەرنجدانی

ورد بە مانا و دەلالەتە قامووسی و پاڵەکییەکانی وشەکان دەستیان کردووە بەکارهێنانی ئەم وشانە لە ناو بەرهەمەکانیاندا.

## ١٥. ئەخلاق و زانستی ئەخلاق، مێتافیزیک و زانستی مێتافیزیک

ئەگەرچی هەمووان دەزانن ئەخلاق لە زانستی ئەخلاق جیایە و سیاسەت لە زانستی سیاسەت جیایە، بەڵام لە زۆرێک لە دەقە کوردییەکاندا بینیومە وەرگێڕ سەرنجی نەداوەتە جیاکردنەوەی ئەو دوو چەمکە و لێرەدا پیتی S کە واتای زانست دەخاتە سەر چەمکەکە بە تەواوی پشتگوێ خراوە. هەر ئەم خاڵە سادەیە کاتێ تۆزەک جیدی دەبێتەوە کە بزانین هەر ئەم چاوپۆشییە لە وەرگێڕانی کۆمەڵێ زاراوەدا گرفت بۆ خوێنەر دروست دەکات. بۆ نموونە، مێتافیزیک نەک هەر چەمکێکی فەلسەفییە بەڵکوو لە هەندێ قوتابخانەی فیکری یان ئایینیشدا ئاماژە بۆ ئاقارێک دەکات کە هەرچەندە نابیندرێ و هەست پێناکرێ، بەڵام هەردەم ئامادەیە و لێرەدا بە مانای سەرسروشت بەکار دەبرێ. ئەم زاراوەیە بۆ زۆربەی خوێنەران نامۆیە و بە تەواوی جیایە لە مێتافیزیکس کە زانست یان فەلسەفەی لێکۆڵینەوەی مێتافیزیکە. وەرگێڕی کورد هەر دوو زاراوەکە بە شێوەی مێتافیزیک وەردەگێڕێ. مێتافیزیکس یان فەلسەفە و زانستی مێتافیزیک ئەو فەلسەفە و یا خود زانستەیە کە لە مێتافیزیک و تایبەتمەندییەکانی و جۆرەکانی دەکۆڵێتەوە. هەر بە هەمان شێوەش، مێتافیزیکی بە تەواوی لە مێتافیزیک جیایە و لێرەدا چیدی وەک سەرەوە کێشەکە لە سەر جیاوازیی بچوکی نێوان، بۆ نموونە، ئایدیۆلۆجیک و ئایدیۆلۆجیکی، نییە بەڵکوو مێتافیزیک دەتوانێ ئاماژە بۆ ئاقارێک بکات کە لە سەرانسەری مێژوودا چەندین کتێبی گرنگی لە سەر نووسراوە؛ کەچی «مێتافیزیکی» لەوانەیە تەنها تایبەتمەندی یان وێکچوونییەک لەگەڵ شتێک یان دیاردەیەکی مێتافیزیکدا دەربخات. کەواتە، پێویستە ئەم جۆرە زاراوانە زۆر بە پارێزەوە بەکار بهێنرێن. لە وەرگێڕانی دەقی فەلسەفی و تیۆریکدا ئەبێ بە هەستیاریی تەواوەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم جۆرە زاراوەگەلەدا بکەین لەبەر ئەوەی بەکارهێنان یان نەهێنانی یەک «ی»ی بە ڕواڵەت بێبایەخ لەوانەیە ماناکە بە تەواوی بگۆڕێ.

لە پەخشانێکی ئەمپرێسیۆنیستیدا «واقیعی» پەیوەستە بەو لایەنەی واقیع کە نووسەری دەقەکە بە شێوەیەکی تایبەت و تاکەکەسی هەوڵی بەرجەستەکردنەوەی داوە.

لە لایەکی ترەوە، مانای زاراوەی «بابەتی واقیعی» لە بنەڕەتدا و یەکسەر لەو دوو زاراوەی سەرەوە جیاوازە. ئەم زاراوەیە زیاتر لە بۆچوونی دەروونشیکارانەی لاکانی و بەرهەمی لایەنگرانی ئەو قوتابخانەیە (وەک ژاک ئالێن میلێر و سلاڤۆی ژیژەک) دێتە بەکارهێنان. لاکان بە کاریگەرێتی وەرگرتن لە فەلسەفەی هێگێل و شێوەڕوانینی هێگێل بۆ ساتەوەختی یەکانگیریی نێوان سوژە و سروشتی دنیاداگر ئەم زاراوەیەی دەکار گرت. واتای چەمکی «سروشتی دنیاداگر»ی هێگێلی دەگەڕێتەوە بۆ واتای تایبەتی چەمکی جەوهەر لە فەلسەفەی لایبتیسدا. «بابەتی واقیعی» یەکێکە لە دژوارترین زاراوەکان لە سیستەمی هزریی لاکاندا و تێگەیشتن لەم چەمکە پێویستیی حاشاهەڵنەگری بە تێگەیشتن لە چەمکی «ڕۆحی ڕەها»ی هێگێل هەیە. بابەتی واقیعی لە لاکاندا، وەک چۆن هێگێل لە ئەمئەوێتیی سوژە و ئۆبژەدا ئاماژەی بۆ کردووە، چرکەساتێکی هەڵکەوتە و کورتخایەنە. بابەتی واقیعی ئەو ساتەوەختە و ئەو دۆخەیە کە لە زماندا نایەتە دەربڕین؛ واتە، بە تەواوی لە بابەتی هێماییین جیایە کە زمان سازی دەکات. مەبەست لەم کۆمەڵە یاداشتە شیکردنەوەی شێوەی ڕاستەقینەی وەرگێڕانی ئەو چەمکانەیە نەک ڕاڤەکردنیان. لە دێپارتمانەکانی فەلسەفە و ئەدەب و لێکۆڵینەوە فەرهەنگییەکاندا گەلێک کتێب و تێز لەسەر شیکردنەوەی لایەنە جیاجیاکانی ئەم چەمکانە نووسراون و دیارە ئێمە لێرەدا مەبەستمان تەنها هەڵسەنگاندنی هاوواتا جیاجیا کوردییەکانی ئەو چەمکانەیە.

## ١٨. هاوڕەگیی دوو زمانی فارسی و کوردی

نزیکترین زمان لە کوردی لە چەندین ڕووی جیاوازەوە زمانی فارسییە. فارسی و کوردی لە یەک لق و یەک بنەماڵەی زمانیدان و گەلەک وشە و زاراوە لە ئارادان کە لە هەر دوو زمانەکەدا بە یەک شێوە بەکار دەبرێن. ئەم دوو زمانە دەتوانن لە گەلەک ڕووەوە یارمەتیدەری یەکتر بن. ئەوانەی شارەزای هەر دوو زمانی فەرەنسی و ئینگلیزین، دەزانن کە وشە و بە تایبەت زاراوە هاوبەش و هاوواتاکانی ئەم دوو زمانە ئەوەندە زۆرن کە هەر کەسێک تووشی سەرسووڕمان دەکات. لێرەدا چەند نموونەیەک لەو وشە و زاراوە فارسیانە دەخەینە بەردەست کە لە وشە

پێکهێنەرەکانیان لە زمانی کوردیشدا ئامادەن، بەڵام خودی زاراوەکە لە کوردیدا بەکار نابرێ. سەیر لەوەدایە لە جیاتی ئەم زاراوانە هاوواتا عەرەبی و ئینگلیزییەکانیان بەکار دەبرێن کە زۆر لە کوردییەوە دوورن. هەندێ لەم زاراوانە کە دەتوانرێن بە بێ گرێ‌وگوڵ لە کوردیشدا بەکار بهێنرێن بریتین لە: دووچەرخە، دووربین، کارکرد، کاربرد، ڕێکار، خودکار، سازە، تاکواژ، زمانپەرێشی، دادیار، فیلمنامە، بتاسا (بتئاسا)، خودباوەڕی، پەروەرشتگا، پڕفرۆش، پڕکار.

## 19. دەقی نووسەرانە و دەقی خوێنەرانە

ڕۆڵان بارت (1915-80)، ڕەخنەگر و تیۆریداڕێژی فەرەنسی، لە کتێبی *سی/زی* دا باسی دوو جۆر دەقی ئەدەبی دەکات کە ناوی ناون lisible و scriptable . مەبەستی بارت لە دەقی «لیسیبل» ئەو دەقە سادە و ساکار و هەندێ جار بانگەشەییەیە کە تەنیا یەک ڕاڤە و لێکدانەوەی بۆ دەکرێ. مەبەستیشی لە دەقی «سکغیپتیبل» ئەو دەقە فرەلایەن و قووڵ و چەندواتایەیە کە هەڵگری زیاتر لە یەک لێکدانەوە و ڕاڤەیە. خاڵی سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە زاراوەی یەکەم لە زمانی فەرەنسیدا هەیە، بەڵام ئەوەی دووەم پێشتر لەو زمانەدا وەک ئێستا بە شێوەیەکی فرەپات بەکار نەدەهێنرا. بارت مانای زاراوەی یەکەمی گۆڕی و ئەو زاراوەیەی بە مانایەکی تر بەکار هێنا. واتە، زاراوەی «لیسیبل» لە فەرەنسیدا بە مانای ئەو دەق و نووسراوەیە بەکار دەبرێ کە دەتوانرێ بخوێندرێتەوە، کەچی ڕۆڵان بارت بۆ دەلالەت و مانایەکی دیکە بەکاری دەهێنا. خاڵێکی تری سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە ئەم دوو زاراوە فەرەنسییە هیچ هاوواتایەکی پڕاوپڕیان لە زمانی ئینگلیزیدا بۆ دەست ناکەوێ. بۆیەش، سەرجەم ئەو نووسەر و وەرگێڕانەی زمانی دایکیان ئینگلیزییە لە سەر ئەوە ڕێککەوتوونە کە بۆ وەرگێڕانی ئەو دوو زاراوە فەرەنسییەی ناو بەرهەمەکەی ڕۆڵان بارت لەم دوو زاراوەیەی خوارەوە کەڵک وەربگرن: readerly و writerly . ئەم دوو زاراوەیە لە قامووسە ئینگلیزییەکاندا نابیندرێن و، سەرەڕای ئەمەش، بە گوێرەی یاسا و ڕێساکانی ڕێزمانی ئینگلیزی هەڵەن، چونکە پاشگری ly لە زمانی ئینگلیزیدا بە دەگمەن دەخرێتە سەر ناو و بەڵکوو لەگەڵ ئاوەڵناودا بەکار دەبرێ و ئاوەڵکرداری لێ دروست دەبێ. لێرەدا هەر دوو وشەکە سەرەتا ناو بوونە و ئێستا بەم پاشگرەوە بوونەتە ئاوەڵناو. لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی «ریدیبل» هەیە کە بۆ ئەو مانایەی لای بارت مەبەستە بەکار ناهێنرێ.

خاڵی سەرنجڕاکێشتر ئەوەیە کە هەر ئەم گرفتە دەقاودەق لە وەرگێڕانی ئەم دوو زاراوەیەدا بۆ زمانی فارسیش ڕووی دا. وەرگێڕان و نووسەرانی فارس پاش لێکدانەوە و مشتومڕێکی زۆر بەو ئەنجامە گەیشتن کە بۆ وەرگێڕانی ئەو دوو زاراوەیە کەڵک لە «خواندنی» و «نوشتنی» وەربگرن. بە سەرنجدان بە مانای هەر دوو زاراوەکە لە ڕوانگەی دانەرەکەیانەوە، واتە، ڕۆڵان بارت، دەتوانین لە هەڵەبوونی وەرگێڕانی فارسیی ئەو دوو زاراوەیە تێبگەیین. ئەگەرچی لە زمانی فارسیدا دەکرێ لە «نویسنده» و «خواننده» ئاوەڵناوی دیکە ساز بکرێ، بەڵام ئەو ئاوەڵناوانە بۆ ئەم مەبەستەی ئێرە دوو کەموکوڕییان تێدایە: یەکەم، لە زمانی فارسیدا هەندێ زاراوەی وەک «خوانندەوار»، «خوانندەآسا» یان «خوانندەگونە» زۆر کەم بەکاردەبرێن؛ دووەم، ئەگەریش بەکاریان بهێنین، بە تەواوی مانای ڕاستەقینەی زاراوەکان بەو چەشنەی لای بارت مەبەستە ناگەیێنن. کەواتە، وەرگێڕ و نووسەرانی فارس، وەک ئینگلیزییەکان، ئەم دوو زاراوەیەیان بە شێوەیەک بو سەر زمانەکەیان وەرگێڕاوە کە نەک هەر هەڵەیە بەڵکوو ماناکەشی بە تەواوی تێکداوە.

لە زمانی کوردیدا، بەڵام، ئەگەر بمانەوێ ئەو دوو زاراوەیە بە شێوەیەکی دروست بەکار بهێنین تووشی ئەو گیروگرفتەی وەرگێڕان و نووسەرانی فارسی‌نووس و ئینگلیزی‌نووس نابینەوە. لە زمانی کوردیدا ئەم گرفتە زۆر ئاسان چارەسەر دەکرێ، ئەویش کاتێکە کە بۆ ئەو دوو زاراوە لە بنەڕەتدا فەرەنسییە لە زاراوەگەلی خوێنەرانە و نووسەرانە کەڵک وەربگرین. ئەم دوو هاوواتا کوردییە لە لایەکەوە لەگەڵ ڕێزمانی کوردیدا تەبان و لە لایەکی تریشەوە دەربڕینەکەیان کێشە بۆ ئاخێوەر ساز ناکات. جگە لەمەش، هەر دوو زاراوە کوردییەکە بە تەواوی و پڕاوپڕ هەڵگری هەمان ئەو مانایەن کە ڕۆڵان بارت مەبەستی بوو. با ئەوەش بڵێم کە لە فارسیشدا پاشگری «انە» هەیە، بەڵام قەت ناکرێ بخرێتە سەر دوو وشەی «خواننده» و «نویسنده». لە ساڵی ١٣٧٨دا وتارێکم لە سەر بیر و هزری ڕۆڵان بارت لە هەفتەنامەی سیروان بڵاوکردەوە و ئەو دوو هاوواتا کوردییەشم لەوێ بەکار هێنا.

### ٢٠. لێدراو، بردە، بردوو

لە فارسیدا «غربزدە»، «گرمازدە» و «سیاستزدە» بە فراوانی بەکار ئەهێنرن. لە ئینگلیزیدا چەندین شێوەی جیاواز لە گۆڕێدان بۆ دروستکردنی ئەو جۆرە وشەگەلە. هاوواتای ئینگلیزیی «غربزدە»، کە وشەیەکی نەک زۆر کۆنی فارسییە، بە شێوەی جیاجیا بەکار ئەبرێ وەک west-oriented, west-obsessed, west-directed. لە شێوازی بەرزی شاعیرانەدا کەڵک لە poverty-stricken وەردەگیردرێ بۆ ئەو کەس یان شوێنەی بە زەقی هەژاریی پێوە دیارە، واتە «فقرزدە». لە کوردیدا شێوەی جیاجیامان هەن بۆ دەربڕینی ئەم مەبەستە. لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا سەودازەدە-مان هەیە، واتە ئەو کەسەی سەودا یان عەشق بە تەواوەتی کاری لێ‌کردووە. لە کوردیی ئەمڕۆدا دەکرێ عەشقلێدراو بەکار ببەین، وەک چۆن دەوترێ «لێدراومە بۆ ئەو کچە»، یان «لێدرایمە لۆی». بۆ نموونەکانی تر دەتوانین کەڵک لە بردە و بردوو وەربگرین وەک گەرمابردوو، بابردە، ژەمەنبردە، ژەمەنبردوو.

### ٢١. «حیث التفاتی» و مەبەستدارێتی

زاراوەی «حیث التفات» لە دەقە فەلسەفییەکانی هەندێ نەریتی فەلسەفیدا بە زەقی بەکار دەبرێ و زاراوەیەکی عەرەبییە و ئەوڕۆکە هەر بە هەمان شێوە لە فارسیشدا دێتە بەکارهێنان. وەرگێڕانی ئەم چەمکە لە زمانی فارسی و عەرەبییەوە بۆ سەر زمانی کوردی کارێکی بە ڕاستی دژوارە و، سەرەڕای ئەمە، دەرئەنجامەکەشی بە هۆی نادیاری و لێڵیی ماناکەیەوە ناتوانێ بە تەواوی جێگیر بێ. بەڵام ئەگەر سەرنج بدەینە هاوواتا ئینگلیزییەکەی ئەم چەمکە و مۆرفیمە پێکهێنەرەکانی لێکدی جودا بکەینەوە، بە دروستی و بە ئاسانی دەتوانین هاوواتا کوردییەکەشی بۆ دابنێین. هەڵبەت ئەم خاڵە زۆر گرنگە کە ئەم زاراوانە لە نەریتە فەلسەفییە جیاجیاکاندا هەڵگری مانای جیاوازن. «حیث التفاتی» لە دەقە فەلسەفییەکانی سەرجەم نەریتە فەلسەفییەکاندا بە شێوەی intentionality دەردەکەوێ، بەڵام کێشەکە لەوەدایە واتاکەی لەو نەریتانەدا بە تەواوی جیاوازە. مانای ئەم زاراوەیە لە فەلسەفەی شیکارانەدا دەتوانرێ بە سەرنجدان بە مۆرفیمە پێکهێنەرەکانی لێکبدرێتەوە. ئەم زاراوەیە لە یەک مۆرفیمی سەربەخۆ و سێ

مۆرفیمی چەسپاو پێکهاتووە. ئەگەر ئەم زاراوەیە بە سەر مۆرفیمە پێکهێنەرەکانیدا دابەش بکەین، ئەوا بە سانایی گرفتەکەمان بۆ چارەسەر دەبێت:

Intention مەبەست

Intentional مەبەستدار

Intentionality مەبەستدارێتی

زاراوەی ڕەقوتەق و بۆ کورد نامۆی «حیث التفاتی» لە کوردیدا دەکرێ بە شێوەی مەبەستدارێتی تەرجەمە بکرێ کە، لە لایەکەوە، وەرگێڕانێکی دروستە و لە لایەکی تریشەوە سوودبەخشە لە تێگەیشتنی واتای چەمکەکە و، بێجگە لەمانەش، بە تەواوەتی لەگەڵ یاسا و ڕێساکانی ڕیزمانی کوردیدا دێتەوە.

هەر ئەم زاراوەیە لە هونەری ڕەوانبێژی و ڕوونبێژی لە زانستی واتاکاندا، بە مانای گۆڕینی گۆشەنیگا دێتە بەکارهێنان و ئەمەش ئەو تەکنیکەیە کە بۆ نموونە بە لێشاو لە قورئانی پیرۆزدا بە کارهاتووە. کەچی، مانای قاموسیی «التفات» بە کەڵکوەرگرتن لە وشەنامەی دێهخودا برێتییە لە «ئاوڕدانەوە». هەروەتر، مانای یەکسەر جیاوازی ئەم زاراوەیە لە دوو نەریتی فەلسەفەی ئوروپایی و فەلسەفەی زەیندا دەردەکەوێ. ئەنسایکلۆپێدیای فەلسەفەی زانکۆی ستەنفۆرد بەم چەشنە چەمکەکەی پێناسە کردووە: «توانست و هێزی زەین بۆ لەخۆگرتن و نواندنەوەی شتەکان و حاڵەتەکان». ئیدی لێرەدا ئەم زاراوەیە بە هیچ شێوەیەک بە مانای مەبەستدارێتی بەکار نابرێ و بەڵکوو ماناکەی بە تەواوی جیاوازە. ئەم چەمکە لەم مانایەیدا لە فەلسەفەی ئیسلامی و فەلسەفەی سکولاستیکی چەرخەکانی ناوەڕاستدا پەرەی پێدراوە و لە سەدەی بیستەمیشدا ئێدمۆند هوسێرل کاری زۆری لەسەر ئەم تیۆرییە کرد و پێی وابوو ئەمە بنەڕەتیترین خەسڵەتی هۆشیاریی مرۆڤە و ناوەرۆکی سەرەکیی دیاردەناسیش پێکدەهێنێ.

## ٢٢. پێکهاتەیی، سروشتی، ڕێژەیی

ئایا تا ئێستا بیرتان لەوە کردۆتەوە زاراوەی «ساختارگرائی» لە زمانی فارسیدا هەڵگری هەڵەیەکی هەرە گرنگە؟ ئەگەر بەر وردی سەرنج بدەینە هاوواتا ئینگلیزی و فەرەنسییەکەی، تێدەگەیین کە ئەم زاراوەیە پێویستە لە زمانی فارسیدا بە شێوەی «ساختاری‌گرائی» وەربگێڕدرێ، چونکە لە ئینگلیزیدا بە شێوەی structuralism دەنووسرێ نەک structurism. هەر بە هەمان شێوەش، بەکارهێنانی زاراوەی «طبیعت‌گرائی» بۆ naturalism هەڵەیە و «طبیعی‌گرائی» دروستە. «طبیعت گرائی» وەرگێڕانی دروستی چەمکێکی ترە: naturism. پێویست بە وتن ناکا کە جیاوازییەکی زۆر لە نێوان دوو چەمکی سروشتی‌خوازی و سروشت‌خوازی لە ئارادایە.

زۆربەی هەرە زۆری نووسەر و وەرگێڕە فارسەکان و تەنانەت ناودارەکانیشیان تا ئێستا ئاماژەیان بە هەڵەبوونی ئەم کۆمەڵە زاراوە فارسییە نەکردووە و ئەوانیش هەر زاراوەگەلی «ساختارگرائی»، «طبیعت‌گرائی» و «نسبیت‌گرائی» لەبری «ساختاری‌گرائی»، «طبیعی‌گرائی» و «نسبی‌گرائی» بەکار ئەهێنن. ئەو وەرگێڕە کوردانەی شارەزای باسە تیۆریکەکان نین هەر بە هەمان شێوە و بە پێی زاراوە فارسییەکە زاراوەیەکی کوردی لە بری ئەو چەمکانەی سەرەوە دروستدەکەن؛ بۆ نموونە، لە جیاتی سروشتی‌گەرایی یان سروشت‌خوازی، دەنووسن سروشت‌گەرایی یان سروشت‌خوازی (سەبارەت بەوەی ئایا سروشتی‌گەرایی دروستە دواتر هەر لێرە دەدوێین). وەرگێڕانی نادروستی ئەو چەمکانەی سەرەوە بۆتە هۆی بەدیهاتنی سەرلێشێواوی و چەوت تێگەیشتنێکی یەکجار زۆر: کە وتمان «ساختارگرائی» یان «پێکهاتەخوازی»، وا دەزانرێ ئەندامانی سەر بەو قوتابخانەیە «ساختار» یان پێکهاتەیان بە لاوە گرنگە! لە ڕاستیدا وا نییە و ڕەخنەگرانی سەر بەم قوتابخانەیە «ساختار» و بنەمایان ناوێ چونکە ئازادی یان یەکسانی یان هەر چەمکێکی تری لەم تاقمە نییە کە کەسێک بیەوێ. ئێمە ئازادی‌خواز و یەکسانی‌خوازمان هەیە، بەڵام کەس پێکهاتەخواز نییە.

کلیلی تێگەیشتنی ئەم شاراوەییە لەوەدایە کە ئەو ڕەخنەگرانەی بە پێکهاتەخواز ناویان دەرکردووە لە ڕووبەڕووبوونەوەی بابەتی بەرباسیاندا بە شێوەیەکی پێکهاتەیی هەڵسوکەت دەکەن، واتە، ئەوان بابەتی بەرباس وەکوو سیستەمێکی پێکهاتەیی ڕەچاو دەکەن و لێی دەکۆڵنەوە. بۆ نموونە، دەروونشیکارێکی پێکهاتەیی‌خواز زەینی مرۆڤ وەک پێکهاتەیەک کە هەڵگری دوانە

لێکدژەکانە ڕەچاو دەکات و پێی وایە پێوەندییەکی پێکهاتەیی لە نێوان بەشە پێکهێنەرەکانی زەینی مرۆڤ لە ئارادایە. هەر بە هەمان شێوەش، ئوستوورەناسێکی پێکهاتەییخواز، ئوستووره وەکوو سیستەمێکی خاوەن پێکهاتە لە قەڵەم دەدا کە هەڵگری دوانە لێکدژەکانە. یان، ڕەخنەگرێکی ئەدەبیی پێکهاتەییخواز سەرەتا ئاوڕ لە بنەمای دەقی بەرباس دەداتەوە و ئەو پێوەندییە پێکهاتەییەی لە نێوان پاژەکانی دەقەکەدا لە ئارادایە، دەخاتە بەر باس و شیکردنەوە. کەواتە، کەس پێکهاتەخواز نییە و بەڵکوو هەندێ بیرمەند و ڕەخنەگر، وەک پێکهاتەییخوازەکان، بە شێوەیەکی پێکهاتەیی ڕووبەڕووی بابەتی بەرباس دەبنەوە.

ئەو وتانەی سەرەوە سەبارەت بە سروشتخوازی و سروشتیخوازی-یش ڕاستن. سروشتخواز، واتە naturist، ئەو کەسەیە سروشتی دەوێ بە هەموو پێکهاتە و تایبەتمەندییەکانیەوە وەک دار و ڕووبار و کەژ و کێو و یان وەک خاوێنی و بێگەردی و بەهێزی. بەڵام سروشتیخواز، واتە naturalist، ئەو کەسەیە کە باوەڕی وایە لە ژیان و بەسەرهاتی مرۆڤ و بوونەوەرەکانی تر و دیاردەکاندا یاسایەکی سروشتی زاڵە کە بریتییە لە کاریگەریی حاشاهەڵنەگری ژینگەی کۆمەڵایەتی و بابەتە بۆماوەییەکان. ناتورالیزم یان سروشتیخوازی بە هیچ شێوەیەک پێوەندیی بە سروشتەوە بەو مانایەی سەرەوە نییە. قوتابخانەی سروشتیخوازی لە سەر دەستی چارڵز داروین و هێربێرت سپێنسێر گەشەی کرد و پاشان لە هەندێ جۆرەی ئەدەبیدا وەک ڕۆمانی سروشتیخوازانەی نووسەرانێک وەک ئێمیل زۆلای فەرەنسی و تۆماس هاردی-ی ئینگلیزی بە تەواوی بڵاوبووەوە. سروشتیخوازەکان چونکە باوەڕیان بە ئاکامە خراپەکانی ژینگە و بۆماوەیی لە سەر کەسایەتییەکان هەیە کەواتە سروشتخواز نین و بگرە دژی دەرکەوتەکانی ئەم دیاردەیەشن. ئەگەر لەم بەستێنەدا بڵێین سروشتخواز، ئەوا نەک هەر هەڵەیەکی گەورەمان کردووە بەڵکوو زاراوەیەکی پێچەوانەشمان بۆ داناوە؛ هەربۆیەش دەبێ بڵێین سروشتیخواز. ئەمەش ئەو بیرمەند و نووسەرانە دەگرێتەوە کە لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بابەتی بەرباسدا لە یاسای سروشتێتیی داروینی پێڕەوی دەکەن و هەر بۆیەش ئازادی و سەربەستی لە مرۆڤ دەسێننەوە و پێیان وایە مرۆڤ وەک بووکەشووشەیەک وایە و دۆش داماوە بە دەستی تایبەتمەندییە سروشتییەکانی خۆیەوە. مرۆڤ لە ڕوانگەی سروشتیخوازەکانەوە ئازاد نییە و بە هیچ شێوەیەک ناتوانێ چارەنووسی خۆی بەو شێوەیەی ئەیەوێ دیاری بکات. سروشتیخوازەکان بە شێوەیەکی گشتی ڕەشبینن و ئەم چەمکەش بە تەواوەتی جیاوازە لە سروشتخوازی. دۆخی نالەباری زمانی زانستیی کوردی لەوێوە دەست پێدەکات کە شاعیران و نووسەران لە جیاتی

ئەوەی ببنە پێوەرێک بۆ ڕێکوپێکی و تێگەیشتوویی و وردەکاری، واتاکان تێکدەدەن. بۆ نموونە، چەند ساڵ پێش ئێستا لە گۆڤارێکدا وتووێژێکم لەگەڵ شاعیرێکی ناسراوی کورددا خوێندەوە کە گوتبووی «شیعری کوردی شیعرێکی ناتورالیستییە چونکە زۆر باسی سروشت و لایەن و تایبەتمەندییەکانی سروشت دەکات».

## ۲۳. ڕێژەیی‌خوازی و مێژوویی‌خوازی

هەر وەک چۆن لە یاداشتی پێشوودا بە وردی ئاماژەم بۆ کرد پێویستە لە جیاتی پێکهاتەخوازی و سروشت‌خوازی بنووسین پێکهاتەیی‌خوازی و سروشتی‌خوازی، لێرەش هەڵەیە گەر بۆ زاراوەی relativism بنووسین ڕێژەخوازی یان ڕێژەگەرایی. ئەم زاراوەیە نەک هەر لە تیۆریی ئەدەبی و فەرهەنگیدا دێتە بەکارهێنان، بەڵکوو لە زانستی فیزیکیشدا بە لێشاو بەکار دەبرێ. لە ڕاستیدا ڕێژەخوازی پێوەندیی چییە بە تیۆرییە بەناوبانگەکەی ئەنشتاین-ەوە؟ ئەو تیۆرییە لە بنەڕەتدا ئاوڕ لە بابەتی ڕێژەیی و ڕێژەییەت دەداتەوە نەک ڕێژە. هەر بۆیەش شێوەی دروستی بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە چ لە زانستی فیزیکدا و چ لە تیۆریی ئەدەبی و فەرهەنگیدا ڕێژەیی‌خوازیی-یە نەک ڕێژەخوازی. لە فارسیشدا هەر ئەم هەڵە گەورەیە جاروبار لەسەر دەستی نووسەر و وەرگێڕە ناشارەزاکان دووبارە دەبێتەوە و دەنووسن «نسبیت‌گرائی» کە دروستەکەی «نسبی‌گرائی»-یە. دیسانەوەش لێرەدا کەس خوازیاری ڕێژە نییە، بەڵکوو مەبەست لە ڕێژەیی‌خوازیی ئەوەیە کە بیرمەندەکان ڕوانگە و بۆچوونیان بە گوێرەی یاسای ڕێژەیەتی دادەمەزرێنن و بە شێوەیەکی ڕێژەیی و بە پێی ئەو دونیابینییە، ڕووبەڕووی دیاردەی بەرباس دەبنەوە کە لەسەر قانوونی ڕێژەییەت دامەزراوە. ئەم وتانە دەربارەی چەمکی مێژووگەرایی یان مێژووگەری ڕاستن، چونکە شێوەی دروستی ئەو زاراوەیە مێژوویی‌خوازی-یە. بۆیەش، ئەم زاراوانەی بەردەست بە شێوەی خوارەوە وەردەگێڕدرێن:

history مێژوو

historic, historical مێژوویی

historiography مێژوونووسی

historicity مێژوومەندی

historicism مێژوویی‌خوازی

## ٢٤. مێتۆد، مێتۆدیست، مێتۆدۆلۆژی

زاراوەگەلی مێتۆد و مێتۆدۆلۆژی وێڕای ساکارییەکی ڕووکەشیانە و خەڵەتێنەر، لەو تاقمە زاراوانەن کە لەم چەند ساڵەی دواییدا مشتومڕێکی زۆرم لەگەڵیاندا کردووە. وەرگێڕانی ئەم زاراوانە ئەوەندە کێشەسازکەرە کە لە کتێبی *فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی* (2002)دا هەر بە هەمان شێوەی ئەسڵی، واتە مێتۆد و مێتۆدۆلۆژی، دامناون. بەشێکی زۆری دژوارییی وەرگێڕانی ئەم زاراوانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پێوەندیی ڕاستەوخۆیان بە ڕێسا زانستییەکان و تایبەتمەندییەکانی دەقێکی زانستییەوە هەیە و، هەر وەک پێشتریش لە کتێبی *گەڵاڵەی پارادایمی پەرەسەندنی کولتووری* (2004) بە وردی باسم لێ کردووە، سەرنجدان بە زمانی زانستی و پێودانکەکانی یەکێکە لە ئەرکە سەرەکییەکانی سەر شانی گوتارە فیکرییە جیاجیاکانی ئامادە لە کۆمەڵگای ئێمەدا. لە فارسیدا بۆ ئەم زاراوەیە هاوواتای «روش‌شناسی» دانراوە و بە تەواوی جێگیر بووە، بەڵام لە کوردیدا هەر یەکە لە ڕەوشت (بە مانای ئاکار و چۆنیەتیی هەڵسوکەوت) و ڕەوش (بە مانای بارودۆخ) بە هیچ شێوەیەک مانای زاراوەکە ناپێکن. ڕەحمەتی شوکور مستەفا پێی وتم با «ڕێڕەو» و «ڕێڕەوناسی» بەکار بێنین و منیش لە وەڵامی پێشنیازەکەی ئەو مامۆستا پایەبەرزەدا وتم «ڕێڕەو» دەمانخاتەوە بیر ڕاڕەو و هەڵگری واتایەکی زانستیش نییە. لە دەستەواژەی «ڕێبازەکانی لێکۆڵینەوە»دا مەبەست لە ڕێباز هەمان مێتۆدە. ڕێباز لە کوردیدا زیاتر لە بەستێنێکی ئایینی و سیاسیدا بە کار دەبرێ وەک چۆن دەوترێ ڕێبازی سۆفیگەری. لە مەسیحیەتیشدا، ئایینزای مێتۆدیست هەیە کە سەر بە کلیسای مێتۆدیستە و ئەم زاراوەیە لە زمانی ئینگلیزیشدا جگە لە واتا زانستییەکەی، خاوەن دەلالەتێکی ئایینی و کۆمەڵایەتیشە. هەر بۆیەش، پێم وایە دەتوانرێ لە هەر دوو شێوەکە، واتە هەم مێتۆد و هەم ڕێباز، کەڵک وەربگیردرێ.

## ٢٥. گوتار، گوتارمەند، گوتارمەندی

یەکێکی تر لەو زاراوانەی تەنانەت ئێستاکەش پاش ئەم هەمور ڕوونکردنەوە و بەکارهێنانەوەیە بۆتە هۆی چەوت تێگەیشتن و سەرهەڵدانی مشتومڕێکی زۆر، زاراوەی «گوتار»ە. ئەم زاراوەیە وەرگێڕانی discourse ی ئینگلیزییە و گەرچی بە مانای وتە و گوتەش بەکار دەبرێ، بەڵام بە هیچ شێوەیەک مانای وتووێژ و گفتوگۆ نادات. ئەگەرچی لە زمانی فارسیدا هاوواتای

«گفتمان» بۆ ئەم زاراوەیە دانراوە، بەڵام زۆرێک لە فارسی‌خوێنەکان هێشتا هەر پێیان وایە مەبەست لەم زاراوەیە هەمان «گفتگو»یە. زۆر جار کە دەقەکان دەخوێنینەوە یان گوێمان لە قسەی سەرزارەکیی خەڵکی ناشارەزا دەبێ، تێدەگەیین گوتار یان «گفتمان» بە مانای گفتوگۆ بەکار دەهێنن. لە ڕاستیدا، ئەمە بە تەواوی هەڵەیە و پیشاندەری ئاستی نزمی خوێندەواریی کەسەکەن. چەمکی گوتار یان «گفتمان» و لە عەرەبیدا «خطاب» هیچ پێوەندییەکی بە گفتوگۆ و وتووێژەوە نییە و بەڵکوو دەلالەت لە مانایەکی تەواو جیاواز دەکات.

ئەم چەمکە بە شێوەیەکی فرەپات لە بەرهەمەکانی فووکۆدا دێتە بەکارهێنان و هەڵگری واتایەکی تایبەتە لە بۆچوونە کۆمەڵناسانەکاندا و لەم جۆرە دەقانەشدا بە هیچ شێوەیەک بە مانای گوتە و قسە و یان وتووێژ نییە. هەر بۆیەش، دانانی زاراوەی «سخن» لە فارسیدا بۆ ئەم مەبەستە، هەڵەی زەقی ئەو وەرگێڕانە دەردەخات. گوتار لەم مانایەدا دەتوانێ بەش، ئاست، پراکتیس یان جۆرێک کردەوەی کۆمەڵایەتی بێت. فووکۆ لە کتێبی *دێرینەناسیی زانیاری*دا هەندێ جار ئەم زاراوەیەی هاوتەریب و تەنانەت تا ڕادەیەکیش هاومانا لەگەڵ چەمکی ڕووداودا بەکار هێناوە. بۆ نموونە، کە دەوترێ گوتاری پزیشکی، مەبەست ئەو پراکتیسەیە کە بەشەکانی بریتین لە پزیشک، خەستەخانە، پەرستیار، جلی سپیی ناو هۆڵەکان، بێدەنگی، خاوێنی و هتد. کە دەڵێین گوتاری ئەکادێمیک، مەبەست ئەو پراکتیسە کۆمەڵایەتییەیە کە بەشە پێکهێنەرەکانی بریتین لە زانکۆ، مامۆستای زانکۆ، خوێندکار، کتێب و نامیلکە و کتێبخانە، ژورناڵەکان و ئەوەی پێوەندیی بە ئەکادیمییەوە هەیە. هەر بە هەمان شێوە، دەکرێ لەم زاراوانەی خوارەوە کەڵک وەربگرین:

اعمال گفتمانی، کردەوە گوتارمەندەکان discursive practices

شکل‌گیری گفتمانی، بیچمگیریی گوتاریانە، پێکهێنانی گوتارمەند discursive formation

### ٣٦. خواخوازی، خواباوەڕی، خواپەرستی، خواناسی

ئەم چوار زاراوەیە گەرچی بە ڕواڵەت وەکیەک دێنە بەرچاو، بەڵام نەک هەر جیاوازییەکی زۆریان لە نێواندایە بەڵکوو تەنانەت دەلالەت لە چەندین بیروبۆچوونی ئایینی و فەلسەفیی جیاوازیش دەکەن. خواخوازی (theism) نەک هەر لە چەرخەکانی ناوەڕاستدا بەڵکوو لە

سەرەتای ڕۆنێسانسیشدا وەکوو بیرۆکەیەکی کارا لە ئارادا بوو. خواخوازی هەمان ڕوانگەی بۆ خوا هەیە کە ڕێبازە ڕەسەنەکانی ئایینیەکانی ئیسلام و مەسیحییەت هەیانە کە بریتییە لە هەبوونی بڕوا بە خوایەکی هەردەم ئامادە لە هەموو لایەنەکانی ژیان لەم جیهانەدا. بۆ ڕوونکردنەوە و پێناسەی ئەم زاراوانە باشتر وایە کەڵک لەم نموونەیە وەربگرم: هەر وەک چۆن مرۆڤخوازی لە مرۆڤپەرستی جیایە هەر بە هەمان شێوەش خواخوازی لە خواپەرستی و خواناسی جیایە. لە لایەکی ترەوە، خواباوەڕی (deism) ڕوانگەی زاڵی فەلسەفیی سەدەی هەژدەهەمە بۆ چۆنیەتیی پێوەندیی نێوان سروشت و خوا. بە پێی ئەم ڕوانگەیە، گەرچی خوا داهێنەری ئەم جیهانەیە، بەڵام ئەمە یاساکانی سروشتن کە کاری خوا، واتە بەڕێوەبردنی جیهان، ئەنجام دەدەن. خواباوەڕی یان دێیزم بە هۆی عەقڵانییەتی زاڵی نێو هەناوی خۆیدا گەرچی بڕوای بە خوا هەیە بەڵام سەرجەم ئەو ماک و گێڕدراوانەی ئایینەکان کە سەرووتر لە عەقڵی مرۆڤن ڕەتدەکاتەوە.

خواناسی (theology) ئەو زانستەیە کە لە چییەتی و تایبەتمەندییەکانی خوا و نیشانەکانی و دەرکەوتەکانی و مۆرکەکانی ئایین و ئایینناسی دەکۆڵێتەوە و هەربۆیەش دەکرێ بە ئایینناسی دابنرێ. ئەم زانستە زیاتر خۆی بە لێکۆڵینەوەی ئایینە تاکخواییەکانەوە خەریک کردووە و هەربۆیەش لەوانەیە هەندێ جار وەک دینناسی یان ئایینناسی پێناسە بکرێ. ئەگەر خواناسی ببێتە بنەڕەتێک بۆ سەرچاوەی مەعریفەی مرۆیی، وەک لە فەلسەفەی ئیسلامی یان سکۆلاستیسیزمدا، ئەوا لەم حاڵەتەدا پێی دەوترێ حیکمەت. جێگەی سەرنجە کە لە ناو کورددا حیکمەت بە شێوەیەکی گشتی و زیاتر بۆ wisdom دادەنرێ، واتە ئەو تایبەتمەندییەی کە پێگەیشتوویی و تێگەیشتوویی و ژیری و تەنانەت سەبر و وزەی پێشبینیکردن پێکەوە تێکڕا کۆدەکاتەوە. دیسانەوە خاڵێکی تری گرنگ کە لەوانەیە ببێتە هۆی سەرلێشێواوی لە وەرگێڕانی ئەم زاراوانەدا ئەوەیە کە لە زمانی فارسیدا زاراوەی «الهیات» هاوکات بۆ هەر دوو زاراوەی theology و divinity دادەنرێ، کە لە بنەڕەتدا تەعبیر لە دوو مەبەستی تەواو جیاواز دەکەن کە یەکەمیان وەک زانست و دووەمیان وەک چەمک و تایبەتمەندی بەکار دەبرێ. لە کوردیدا بۆ divinity دەکرێ مینۆکی یان یەزدانێتی بەکار بەرین وەک لەم نموونانەی خوارەوەدا دەیبینین:

divine ئاسمانی، یەزدانی، مینۆکی

the divine بابەتی یەزدانی، بابەتی مینۆکی

divinity یەزدانێتی

## ٢٧. ڕەمز یان هێما؟

ئێمە هێما بۆ symbol بەکار ئەهێنین، بەڵام لە باشووردا بە ڕەمز دادەنرێ کە لە عەرەبییەوە وەرگیراوە. لە فارسیدا کەڵک لە «نماد» وەردەگیردرێ کە تەواو جیاوازە لە واتای «ڕمز» لە فارسیدا. هەروەتر، لەم فەرهەنگەدا نووسەری چیرۆکی هێمایی یان حەکایەتنووس تەواو جیاوازن لە چیرۆکنووسی هێماخواز. یەکەمەیان بۆ allegorist و دووەمیان بۆ symbolist writer دانراوە لەبەر ئەوەی allegory بە چیرۆکی هێمایی، هێماچیرۆک و حەکایەتی ڕەمزدار پێناسە کراوە. ئەم جیاوازیانە زۆرتر کاتێ دەردەکەون کە گەرچی ڕەمزدارانە و ڕەمزاوی بە ڕواڵەت لێکنزیکن، بەڵام دەلالەت لە دوو واتای جیاواز دەکەن.

## ٢٨. «ئایدێنتیتی» وەک ناسنامە و شوناس

چەمکی identity وەک ناسنامە و شوناس بەکار هێنراوە و دواتر بە شێوەی «ئەمئەوێتی» باسی لێدەکەم. لێرەدا ڕووبەڕووی چەمکێک دەبینەوە کە هاوکات لە دوو بەستێنی جیاوازدا و بە دوو مانای تەواو جیاواز بەکار دەبرێ. هەر دوو زاراوەی ناسنامە و ئەمئەوێتی لە بنەڕەتدا بە یەک شێوە لە زمانگەلی ئینگلیزی و زۆربەی زمانە ڕۆژئاواییەکانی تردا دەنووسرێن. هۆکاری سەرەکیی ئەم دوو شێوە جیاوازەی وەرگێڕانی ئەم چەمکە لە زمانگەلی عەرەبی و فارسی و کوردیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زاراوەی identity، هەر وەک پۆل ڕیکۆر بە وردی ئاماژەی بۆ کردووە، لە هەناوی خۆیدا هەڵگری دوو مانای جیاوازە. ڕیکۆر پاش خستنەڕووی لێکۆڵینەوەیەکی ڕەچەڵەکناسانە بۆ زاراوەی identity پێی وایە ئەم زاراوەیە هاوکات بە هەر دوو مانای خودێتی (selfhood) و وەکیەکبوون (sameness) بەکار ئەبرێ. سێ سەدە بەر لە ڕیکۆر، ئەمە لایبنیتس بوو کە بۆ یەکەم جار لە فەلسەفەی مۆدێرندا باسی لە مانا هاوبەشەکانی دوو زاراوەی ئەمئەوێتی (identity) و هاوکێش (equation) کرد. لایبنیتس ئەوەی خستەڕوو کە x وەک y وایە تەنها و تەنها ئەگەر هەموو ئەو گوزارانەی کە دەربارەی x ڕاستن دەربارەی y-یش ڕاست بن. پاش ئەم ڕێسایە لە مەنتیقدا، چەندین جۆری جیاوازی ئەمئەوێتی لە لایەن لایبنیتس-ەوە پێشنیاز کرا کە لێرەدا باسیان ناکەم.

وەرگێڕانی زاراوەی identity لە هەر دوو حاڵەت و ماناکەدا بۆ سەر زمانی کوردی کارێکی سەختە، چ لە مانا گشتی و جەماوەرییەکەیدا کە زۆر لە چەمکی خودێتی نزیکە و چ لە بیرکاری و مەنتیق و فەلسەفەدا کە بە مانای وەکیەکبوون بەکار دەبرێ. لە حاڵەتی یەکەمدا، تۆزەک کارەکە سادەترە چونکە لەم مانایەدا زاراوەکە ڕواڵەتێکی گشتگیرتر لەخۆ دەگرێ و لە بەستێنە جیاجیاکاندا و لە لایەن زۆربەی کەسەکانەوە بەکار دەبرێ و ئەم هاوواتایانەی بۆ دانراوە: شوناس، ناسنامە، پێناس، پێناسە، ناسە، ناسێنە، شناسە، کێیەتی، هەویەت، هەویە. گەرچی زاراوەی شوناس پڕ بە پێستی «هویت» نییە و بۆخۆی بۆتە جێگەی مشتومڕێکی زۆر لە لایەن ڕەخنەگرە جیاجیاکانەوە، بەڵام، لە بەر ئەم هۆیانەی باسی دەکەم، زاراوە پێشنیازکراوەکانی تر ڕەخنەی زۆرتریان لە سەرە. پێناس و پێناسە کە دیارە مانایەکی ئاشکرایان هەیە و بۆ مەبەستێکی تر بە کار دەبرێن و کێشەیان لە سەر نییە. ناسنامە زیاتر دەلالەت دەکاتە سەر چشتێکی بەرهەست کە زانیاری دەربارەی ئێمەی تێدایە، شتێک وەکوو کارت یان بەڵگە، کەچی ئەم چەمکە تایبەتمەندییەکی دەرهەستی هەیە و دەلالەت لە زەینییەت، خەسڵەت، یان لایەنێک لە کەسایەتی یان مۆرکی تایبەتی کەسەکە دەکات. ناسە و شناسە، کە هەر دووکیان لە باری مانایی و ڕێزمانییەوە وەکیەکن، لەکوردیدا زۆر کەم بە کار دەبرێن، هەرچەندە لە فارسیدا ئەمڕۆکە «شناسە» بە تەواوی جێگیر بووە و دەلالەت لە مانایەکی تر دەکات. ناسێنە زاراوەیەکە کە لە باری ڕێزمانییەوە نموونەی زۆر کەممان وەک ئەم زاراوەیە هەیە چونکە ناس ناو نییە و بەڵکوو ڕەگە. هەویە و هەویەت کە دیارە عەرەبین و ئەوەی دووەمیان لە فارسیشدا جێگیر بووە.

کێیەتی زاراوەیەکی دروست و پڕ بە پێستی identity و «هویت»ە، بەڵام زۆر بە کەمی بە کار دەبرێ و کێشەکە لەوەدایە کە تەنها مانای خودێتی لەخۆگرتووە و تێیدا مانای ناسین بە دیار ناکەوێ. شوناس هەمان شناس-ە وەک چۆن سوپاس و سپاس یان سولەیمانی و سلێمانی و سوجادی و سەجادی لەبری یەکتر بەکار دەبرێن. لە لایەکی ترەوە، شوناس هەمان ناس-ە چونکە لە هەندێ شێوەزاری کوردیدا، بە تایبەت لە ئەردەڵانیدا لە بری کرداری ناسین، شناسین بەکار دەبرێ وەک چۆن لە فۆلکلۆری ئەو ناوچەیەدا لە باتی خوانەناس وتراوە خوانەشناس. شناس یان ناس ڕەگی کرداری ناسین یان شناسینن. لە ئەردەڵانیدا شناس بەو کەسەش دەوترێ کە ئێمە دەیناسین و ئەگەر کەسەکەش زۆر بەناوبانگ بێ، ئەوە دەبێتە سەرشناس کە دیارە لە فارسیشدا هەر بە هەمان شێوە بەکار ددەبرێ.

زاراوەی شوناس کە من نازانم کێ بۆ یەکەم جار لە دەقەکانی نیوسەدەی ڕابردوودا بەکاری بردووە، پڕ بە پێستی زاراوەی بەرباس نییە و زیاتر لە ماناى خودێتیی زاراوەکەوە نزیکە و ئێستا بە شێوەیەکی گشتی و فرەپات بەکار دەبرێ. هەر لەم مانایەدا زاراوەگەلێکی ئاشنا وەک شوناسی نەتەوەیی، شوناسی ئایینی و شوناسی سیاسی دروست دەکرێن. کەواتە، هەر دوو زاراوەی شوناس و ناسنامە بە یەک ئەندازە ناتەواون لە دیاریکردنی مانای ڕاستەقینەی ئەم چەمکە و ئێستاشی لەگەڵدا بێ هەر دوو زاراوەکە بە لێشاو بەکار دەهێنرن.

## ۲۹. «ئایدێنتیتی» وەک ئەمئەوێتی

زاراوەی ئەمئەوێتی لە زمانی کوردیدا زاراوەیەکی تازەیە و ئەم ڕۆنانەش گەلەک چەوت تێگەیشتن و یان تەنانەت تێنەگەیشتنی بە دواوە بووە. بێجگە لەمەش، ڕۆنانی چەمکی دژبەری ئەم زاراوەیە کە دەبێتە نائەمئەوێتی چەند هەرایەکی تری ناوەتەوە. هۆی سەرەکیی بەکارهێنانی فرەپاتی ئەم دوو زاراوەیە دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەریی قووڵی نەریتی فەلسەفیی ئایدیالیزمی ئاڵمانی و بە تایبەت فەلسەفەی هێگێل لە سەر بیر و هزری هاوچەرخ. ئەگەرچی ئەم دوو زاراوەیە، واتە identity و non-identity، پێش هێگل-یش بە کار دەهێنران، بەڵام ئەمە هێگێل بوو کە بەشێکی گرنگی سیستەمە فەلسەفییەکەی لە سەر ئەمئەوێتی و نائەمئەوێتیی سوژە و ئۆبژە و هەروەها دۆخە پێوەندیدارەکان بە هەر دوو حاڵەتەکەوە دامەزراند.

*ئەنسایکلۆپێدیای فەلسەفەی ستەنفۆرد* بەم شێوەیە چەمکی ئایدێنتیتی پێناسە کردووە کە بریتییە لەو پێوەندییەی هەر شتێک تەنها لەگەڵ خۆیدا هەیەتی. دیارە لێرەدا «پێوەندی» بۆخۆی زاراوەیەکە لە زانستی مەنتیق و بە تایبەت لە یەکێک لە لقەکانی بیرکاری وەرگیراوە کە ئەویش تیۆریی تاقمە (set theory)؛ هەر بۆیەش ماناکەی گرێ دراوە بە ئاقاری تیۆریی پێوەندییەکانەوە (theory of relations). لە لایەکی تریشەوە، ئادۆرنۆ لە کتێبی *دیالێکتیکی نەرێکارانە*دا (*Negative Dialectic*) باس لە دوو شێوە بیرکردنەوە دەکات کە ناوی ناونەتە بیرکردنەوەی ئەمئەوێتی و بیرکردنەوەی نائەمئەوێتی. ئادۆرنۆ دەیەوێ لە ڕێگەی بەرجەستەکردنەوەی هۆشیارییەکی ڕەخنەگرانەوە نادروستیی بنەماکانی بیرکردنەوەی ئەمئەوێتی دەربخا کە بەو پێیە هیچ چەمکێک ناتوانێ بە تەواوەتی چشتی بەرباسەکەی دەستنیشان بکات.

زاراوەی identity لە کاربردە فەلسەفییەکەیدا، کە لە سەرەوەدا باس‌کرا، لە بەستێنێکی زۆر سنووردارتردا بەکار دەبرێ. لێرەدا ئەبێ بە دوای زاراوەیەکدا بگەڕێین کە لە چەمکی «وەکیەک‌بوون» نزیک بێ. لە زمانی فارسیدا لەم حاڵەتەدا زاراوەی «اینهمانی» بە کار دەبرێ و دژبەرەکەشی کراوە بە «نااینهمانی». لە عەرەبیدا بۆ ئەم مەبەستە لە جیاتی «هویە» کەڵک لە «هوهو» یان «هوهویە» وەردەگیردرێ. دیارە ئەم چەمکانە تەنها لە فەلسەفەدا بەکار ئەبرێن. لە ناو فیلسووفانی ئیسلامیدا ئەبوو عەلی سینا بە سەرچاوەی سەرەکیی پێناسەکەری «هوهو» دادەنرێ. لە فارسیشدا زاراوەی «اینهمان» تازەیە و لە بیست ساڵی ڕابردوودا بە تەواوەتی جێگیر بووە.

من لە وەرگێڕان و نووسینەکانمدا بۆ ئەم چەمکە کەڵکم لە زاراوەی ئەمئەوێتی وەرگرتووە؛ واتە ئەو حاڵەتەی کە ئەم هەمان ئەوە، یان سوژە هەمان ئۆبژە و بابەتە. چەند ساڵ لەمەوبەر ڕەحمەتی شوکور مستەفا پێی وتم دەکرێ لە کوردیدا بۆ ئەم مەبەستە کەڵک لە هاویەکێتی وەربگرین. لە لایەکی ترەوە، مامۆستا ئەحمەد قازی پێی وتم دەتوانرێ لە جیاتی ئەمئەوێتی و نائەمئەوێتی لە یەکانگیری و لێکدابڕان سوود وەربگرین. ئەگەرچی هەر دوو پێشنیازەکەی مامۆستایان شوکور مستەفا و ئەحمەد قازی لە باری ماناییەوە دروست دێنە بەرچاو، بەڵام گرفتەکە لەوەدایە کە کاتێ بمانەوێ لەم ناوانە ئاوەڵناوێک ساز بکەین، تووشی گرفت دەبینەوە چونکە ئاوەڵناوەکانی پێشنیازی یەکەم دەبنە هاویەک و ناهاویەک و ئاوەڵناوەکانی پێشنیاری دووەمیش دەبنە یەکانگیر و لێکدابڕاو. لە پێشنیازی یەکەمدا، سروشتی هەر دوو بابەتەکە (سوژە و ئۆبژە) کراون بە یەک و لە پێشنیازی دووەمیشدا، بە پێچەوانەوە، سروشتی هەر دوو بابەتەکە بە تەواوەتی لە یەکدی جیا کراونەتەوە. ئەمەش لە کاتێکدایە کە ئەم زاراوەیە بۆ هەر دوو مەبەستەکە هاوکات بە کار دەبرێ، واتە لە قۆناغێکدا لەوانەیە هەر دوو بابەتە ببنە خاوەن یەک سروشت. نموونەکان بۆ ئەم حاڵەتە برێتین لەو باسانەی هێگێل کە لە کتێبی *دیاردەناسیی ڕۆح* دا ئاماژەی بۆ کردووە، یان وەک چۆن لە سۆفیگەریدا دۆخێکی زۆر نایاب ڕوو دەدات کە برێتییە لە ئەمئەوێتیی نێوان عارف و خوا یان عارف و جیهان، یان خوا و جیهان؛ ئەمەش ئەو حاڵەتەیە کە بە «وحدت وجود» ناودێر کراوە. بۆ حاڵەتی دووەم نموونەکان برێتین لەو دۆخەی کە هەر دوو بابەتەکە بە تەواوی لە یەکتر جیا دەبنەوە، وەک کەسایەتیی جیاوازی دایک و منداڵ پاش قۆناخی ئاوێنەیی. ژاک لاکان بە کاریگەریی وەرگرتن لە هێگێل ئەم زاراوەیەی بەکار هێناوە. هەر بۆیەش کە وتمان ئەمئەوێتی، لە لایەکەوە هاویەکێتی لە نێوان

ئەم و ئەودا لە ئارادایە و لە لایەکی تریشەوە ئەم وەک ئەم و ئەو وەک ئەو هەر ماونەتەوە. جگە لەمەش، «ئەمئەو» دەتوانرێ بۆ identical بە کار ببرێ کە تێیدا گەرچی ئەم ئەوە و لە ڕواڵەتدا لە یەکدی جیان، بەڵام هەر دووکیان ئەمئەون و لە یەک زاراوەدا یەکیان گرتۆتەوە.

### ۳۰. هۆ، هۆکار، هۆکرد، هۆدار، هۆدارێتی

یەکێک لە ئاڵۆزییەکانی زمانی ئاسایی لە کوردیدا بەکارهێنانی هاوکاتی هۆ و هۆکارە بۆ یەک مەبەست. یان، بە پێچەوانەوە، بەکارهێنانی چەندین مانا و مەبەستی جیاواز بۆ یەکێک لەم دوو زاراوەیە. هەربۆیە گەر لە زمانی ئاساییدا پرسیارتان لێ بکرێ «هۆی چییە ئەمە ڕووی دا؟»، ئێوە بە تەواوەتی لەم پرسیارە تێدەگەن و وڵامیشی دەدەنەوە. بەڵام گەر ئەم پرسیارە لە فەلسەفە و یان لە زانستدا ئاراستە بکرێ، سەرەتا دەپرسین مەبەست لە هۆ لەم ڕستەیەدا چییە؟ واتە، لە نێوان «علت» و «دلیل»دا کامیان مەبەستە؟ لێرەدا بۆ ڕوونترکردنەوەی باسەکە، هاوواتا ئینگلیزی و فارسی و کوردییەکان بەم شێوەیەی خوارەوە دەخەمە بەر چاو:

هۆ، دلیل reason

هۆکار، علت cause

هۆکرد، معلول effect

هۆدار، علی causal

هۆدارێتی، علیت causality

لە وەرگێڕانی دەستەواژە بەناوبانگەکەی کانتدا لە دەستپێکی وتاری «ڕۆشنگەری چییە؟» دەتوانین کەڵک لە زاراوەی خود-هۆکار (self-caused) وەربگرین. یان، دەستەواژەی ناسراوی «رابطەی علت و معلول» بە شێوەی پێوەندیی هۆکار و هۆکرد تەرجەمە بکەین. هەر بە هەمان شێوەش، بۆ «علی» دەکرێ هۆدار بەکار بهێنین و کەواتە تەرجەمەی زاراوەی «ساختار علی» دەبێتە پێکهاتەی هۆدار. هەر لە سەر ئەم ڕێچکەیە، «علیت» یان هۆدارێتی بریتییە لە پێوەندیی نێوان هۆکار و هۆکرد. لێرەدا هۆکار وەک ڕووداوی یەکەم و هۆکرد وەک دیاردە یان ڕووداوی دووەم دادەنرێ بەو مەرجەی دیاردەی دووەم وەک دەرئەنجامی ڕووداوی یەکەم لەقەڵەم بدرێ.

لەوانەیە ئەم بابەتە تا ڕادەیەک ئاسایی بێتە بەرچاو، بەڵام گرنگایەتیی ئەم باسە کاتێ زیاتر بۆمان دەردەکەوێ کە بزانین فەلسەفەی هاوچەرخ پاش تێپەڕبوونی دوو هەزار و چوار سەد ساڵ بەسەر دابەشکارییە بەناوبانگەکەی ئەرەستوو کە باسی لە چوار هۆکاری جیاواز لە جەوهەری هەر شتێکدا دەکرد، هێشتا وەک پرسێکی سەرەکی و مەتەڵێکی چارەسەرنەکراو ئاوڕ لەم پێوەندییە دەداتەوە. ئەو چوار هۆکارەی ئەرەستوو ئاماژەی بۆ دەکرد لە عەرەبی و فارسیدا بە «علل اربعه» ناسراون؛ ئەوانیش بریتین لەو چوار هۆکارە سەرەکییەی لە جەوهەری شتێکدا ئامادەن:

هۆکاری مادی material cause

هۆکاری شێوەیی formal cause

هۆکاری کارایی efficient cause

هۆکاریی کۆتایی، هۆکاریی دواهەمین final cause

لە فەلسەفەی ئیسلامیدا، ئەم بنەواشە ئەرەستوویيە لە بەرهەمەکانی فارابی و ئەبوو عەلی سینادا ڕەنگی داوەتەوە؛ هەرچەندە فارابی لە جیاتی «اسباب» کەڵکی لە «مبادی» وەرگرتووە. لە لایەکی ترەوە، پرسی هۆدارێتی پاش چەرخەکانی ناوەڕاست و لە فەلسەفە و زانستی مۆدێرندا پەرەی زیاتری پێدرا و نموونە ئاشکراکان بریتین لە باسی جیاوازییەکانی نێوان گوزارە مەرجدارەکان (conditional statements) و گوزارەکانی هۆدارێتی (statements of causality) لە زانستی مەنتیقدا، یان ڕاڤەی جیاوازی پێوەندیی هۆکار و هۆکرد لە زانستی مێکانیکی کلاسیک لە سەردەمی مۆدێرندا و بە تایبەت لە قانوونی دووەمی نیوتۆن-دا و جیاوازیی قووڵی نێوان هۆ و هۆکار و هۆکرد.

### ٣١. دێرینەناسی یان ڕەچەڵەکناسی؟

گەرچی جۆرێک لە هاوواتایی و نزیکیی مانایی لە نێوان دوو زاراوەی دێرینەناسی و ڕەچەڵەکناسی‌دا دەبنیرێ، بەڵام ئەم دوو زاراوەیە بە تەواوی لە یەکتر جیاوازن و لە دوو بەستێنی جیاوازدا بەکار دەهێنرێن. دێرینەناسی یان کۆنینەناسی (archaeology) بریتییە لە لێکۆڵینەوەی شێوە و تایبەتمەندی و چۆنیەتیی ژیان و چالاکی لە کۆمەڵگا مرۆییەکان لە سەردەمگەلی

ڕابردوودا. دێرینەناسی زیاتر لە ڕێگەی شیکردنەوەی ئەو فەرهەنگ و زانیارییە ژینگەییانەی مرۆڤەکانی سەردەمگەلی ڕابردوو بۆیان بەجێ‌هێشتووین دەست دەکاتە ناسین و هەڵسەنگاندنی شێوەژیانی مرۆڤ لە ڕابردوودا. سەرچاوەی ئەم زانیاریانەش لە هونەرە دەستییەکان و بیناسازی و تەنانەت تایبەتمەندییە جوگرافیاییەکاندایە. هەربۆیەش، لە لایەکەوە وەک لقێک لە زانستە سروشتییەکان و لە لایەکی تریشەوە وەک لقێک لە زانستە مرۆییەکان دەژمێردرێ. دێرینەناسی لە هەندێ وڵاتدا وەک ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە بەشێک لە مرۆڤناسی دادەنرێ و بەڵام لە ئەوروپادا وەک لقێکی زانستیی سەربەخۆ دادەنرێ. ئەم چەمکە لە فارسیدا وەکوو «باستان‌شناسی» بەکار هێنراوە و ئەمڕۆکە کەڵک لە هاوواتای «دیرینه‌شناسی»یش وەردەگیردرێ. کەواتە، نموونەیەکی زۆر ساکار لەم هاوواتاسازییە بریتییە لە وەرگێڕانی کتێبە بەناوبانگەکەی میشێل فووکۆ بە شێوەی *دێرینەناسیی زانیاری* (*Archaeology of Knowledge*). ڕەچەڵەکناسی (genealogy) بریتییە لە لێکۆڵینەوەی بنج و بناوان و ڕەچەڵەکی خێزانەکان و جێ‌پەنجە و ڕابردوویان لە مێژوودا. بۆیەش، ڕەچەڵەکناسەکان گرنگی دەدەنە دابونەریتە زارەکییەکان و بەڵگە مێژووییەکان بە مەبەستی دەرخستنی پێوەندیی چەندلایەنەی نێوان خێزانە جیاجیاکان و ئەندامانی ئەو خێزانانە. لە کاتێکدا دێرینەناسی یان کۆنینەناسی بریتییە لە ناسینی ڕابردوو، ڕەچەڵەکناسی بریتییە لە گەڕان بە دوای سەرچاوەکان و بنج و بناوانی بابەتی بەرباس. بۆ نموونە، لە زمانناسیدا «ڕەچەڵەکناسیی وشە» کە لە فارسیدا وەک «تبارشانسی واژگان» بەکار دەبرێ بریتییە لە گەڕان بە دوای ڕەچەڵەکی وشەیەک و چۆنیەتیی بەکارهێنانی لە ڕابردوودا و پێوەندیی نێوان شێوەی بەکارهێنانی لە ئێستا و ڕابردوودا و، یان، پێوەندیی نێوان شێوەی جیاوازی بەکارهێنانی ئەو وشەیە لە چەندین زمان و زاری هاوبنەماڵەدا. ئەم کارە دەچێتە خانەیەک کە بە ڕەچەڵەکناسیی زمانناسانە ناوزەد دەکرێ (linguistic genealogy).

## ٣٢. سوژە یان سوبژە؟

لە هەندێ نووسینی فارسی و کوردیدا و بە تایبەت ئەو دەقانەی دەچنە نێو خانەی دەقی فەلسەفی و تیۆریکەوە چاوم بە زاراوەی سەیروسەمەرەی «سوبژە» کەوتووە. دیارە ئەو بەڕێزانە مەبەستیان «سوژە»یە و ڕەنگە ئەم زاراوەیەیان بە پێی ڕوخساری «ئۆبژە» دروست کردبێ، کە بە ئاسانی وەک سوبژە و ئۆبژە دابندرێن، کەچی ئەمە یەکسەر هەڵەیە و هەر تەنها ژمارەیەکی کەمی نووسەر لای ئێمە لەو جۆرە زاراوە نامۆیانە کەڵک وەردەگرن. لە زمانەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئاڵمانیدا زاراوەیەک بە ناوی سوبژە لە گۆڕێدا نییە. ئەم زاراوەیە لە فەرەنسیدا بە شێوەی سوژە و لە ئاڵمانیدا بە شێوەی سوبژێکت و لە ئینگلیزیدا بە شێوەی سابجێکت بە کار ئەهێنرێ، کەچی لە هەندێ دەقی فارسی و کوردیدا وەک سوبژە ناوی لێ دەبرێ.

سوژە گەرچی لە ڕێزماندا وەک کارا یان بکەر دەردەکەوێ، بەڵام چ لە فەلسەفەی مۆدێرندا و چ لە تیۆری و ڕەخنەی هاوچەرخدا بە مانای تاکەکەس و مرۆڤ دێتە بەکارهێنان. کە دەوترێ سوژەی فرۆیدی مەبەست شێوەی ڕوانینی فرۆیدە بۆ مرۆڤ یان کە دەوترێ سوژەی پاشپێکهاتەیی‌خواز مەبەست مرۆڤە لە ڕوانگەی فەلسەفەی پاشپێکهاتەیی‌خوازییەوە. پاش دیکارت، لە نەریتی فەلسەفەی ئایدیالیستی ئاڵمانیدا پەرە بەم زاراوەیە درا و پاشان لە سەدەی بیستەمدا و بە تایبەت پاش فرۆید مۆرکی سەربەخۆیی و یەکگرتوویی لە سوژە سەندرایەوە و بە پێچەوانەوە سوژە بوو بە خاوەنی شوناسێکی پارچەپارچە. کەواتە لە دەقی فەلسەفی و تیۆریکی زۆربەی قوتابخانە هاوچەرخەکاندا لە زاراوەی سوژە لە جیاتی تاکەکەس یان مرۆڤ کەڵك وەردەگیردرێ، کە دیارە ناسنامەکەی بەندە بە ئەویترەوە. سوژە بە ماناگەلی بکەر، ناسکار، ناسێنەر، بابەت و بابەتی تێگەیین-یش دێتە بەکارهێنان.

## ٣٣. ئۆبژە: بەرکار، بەرناس، شت، چت، تشت، چشت و بابەت

بۆ زاراوەی ئۆبژە لە کوردیدا، جگە لە «بەرکار» کە لە ڕێزماندا بەکار ئەهێنرێ، دەکرێ سوود لە هاوواتای بەرناس، شت، چت، تشت، چشت و بابەت وەربگیردرێ. لێرەدا مەبەست لە بابەت هەمان «عین»ە کە لە هەندێ قوتابخانەی فەلسەفیدا وەک ئایدیالیزمی ئاڵمانی باسی ئەمئەوێتی یان نائەمئەوێتیی زەین و بابەت دەکرێ. بەرناسیش ئەو چەمکە دەرهەست یان چشتە دەرهەستەیە کە لە لایەن زەینی ناسێنەری مرۆڤەوە و زیاتر لە فەلسەفەی مۆدێرندا دەکەوێتە بەر

ناسین. شت (سۆرانی)، چت (ئەردەڵانی)، تشت (کورمانجی) و چشت (کەڵهوڕی) هاوواتای کوردیی ئۆبژەن و گەرچی لە مانای «چیز»ی فارسی نزیکن بەڵام لێرەدا مەبەست ئەو زاراوەیەیە کە چ لە فارسی و چ لە عەرەبیدا وەک «شيء» بە کار ئەهێنرێ.

### ٣٤. بەربێژ، دوابێژ، چەپبێژ، ڕاستبێژ، ناوبێژ

ئەم تاقمە زاراوەیە تایبەتن بە چەشنی ئەدەبیی تراژێدیی کلاسیکی یۆنانی و لە هونەری سەماشدا بەکار دەهێنرێن. ئەمانە کۆمەڵێ بەند یان پارچەهەڵبەستی قەسیدەی یۆنانیش پێکدەهێنن کە بە قەسیدەی پینداری ناسراون و لە بەرهەمەکانی پیندار، شاعیری گەورەی یۆنانی کەونارا، بەکار هێنراون. قەسیدەی پینداری لە سترانی ئەندامانی گرووپی کۆڕ لە تراژێدیی یۆنانیدا بەکار ئەهێنرا و خاوەنی شێوە و شێوازێکی سەخت بوو. ئەگەر ئەندامانی گرووپی کۆڕ بە پێی کێشی سەماکەیان، بەرەو پێشەوە هەنگاویان هەڵبگرتایە، ئەو بەندەیان بە بەربێژ ناودەبرد و گەر بەرەو دواوە بچوونایە ئەو بەندەیان بە دوابێژ پێناسە ئەکرد؛ هەر بە هەمان شێوەش ڕاستبێژ و چەپبێژمان هەیە و گەر لە نێوان ئەم جووڵانەدا ئەندامانی گرووپی کۆڕ بوێستانایە و بەندەکەیان بە ئاواز بوتبایە بەو بەندەیان دەگوت ناوبێژ. جێگەی سەرنجە کە ڕۆنانی ئەم زاراوانە بۆ یەکەم جار لە زمانی کوردیدا لە کتێبی *فەرهەنگی شیکارانەی زاراوەی ئەدەبی*دا ئاراستە کرا و خێراش پاش ماوەیەکی کورت لە لایەن زۆربەی نووسەران و خوێنەرانەوە پەسەند کران.

### ٣٥. وەرگێڕانی ism بۆ کوردی: خوازی، گەرایی، گەری یان گەرێتی؟

لە زمانی کوردیدا بە مەبەستی وەرگێڕانی ism ی ئینگلیزی و isme ی فەرەنسی چەندین پاشگر و ئاوەڵناو بەکار ئەهێنرێ کە هەندێکیان برێتین لە خوازی، گەرایی، گەری، گەرێتی، پەرستی و باوەڕی و هەندێ جاریش «تەوەری» یان «مەڵبەندی». هەر ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە یەک پاشگر دەتوانێ هەڵگری چەندین مانای جیاجیا بێ. سەرەڕای گرنگایەتیی ئەم جۆرە زاراوانە و ئاستی بەرفراوانی بەکارهێنانەوەیان لە زۆربەی وتار و نووسینە زانستی و تەنانەت ڕۆژنامەنووسانەکانیشدا تا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی وردمان بە کوردی لەسەر ئەم مانا جیاجیایانەی نەبینیوە. هەربۆیە لێرەدا هەوڵ دەدەم بە کورتی و بە شێوەیەکی پۆلێنکراو بەشێکی

زۆر لە بەکارهێنان و مانا جیاجیاکانی ئەم پاشگرە ڕوون بکەمەوە. لێرەشدا ڕووبەڕووی دوو کێشەی سەرەکی دەبینەوە: یەکەم کێشەی مانا جیاجیاکانی پاشگری ئیزم و دووەم کێشەی دروستبوون یان نادروستبوونی ئەو هاوواتا کوردیانەی بۆ ئەم پاشگرە دانراون.

«ئیزم» وەک پاشگرێک یان وەکوو مۆرفیمێکی بەستراو بە چەقێکەوە یان بە مۆرفیمێکی سەربەخۆوە لە ڕواڵەتی چەندین شێوەی لێکدراودا لە دەقەکاندا دەردەکەوێ کە سێ شێوەی لێکدراوی سەرەکیی بریتییە لە ئیزم (کە هەمان ئیسمە)، ئیست و ئیستیک (ism, ist, istic) . لە شێوەی یەکەمدا، واتە ئیزم یان ئیسم، ڕووبەڕووی ناوێک دەبینەوە جا چ ناوی قوتابخانە بێ یان ناوی ڕوانگەیەکی فیکری یان تەنانەت جۆرێک لە پیشە و یا خود چەمک و تەنانەت تەکنیک. بەڵام لە شێوەی لێکدراوی دووەمدا، واتە ئیست، ڕووبەڕووی ناوی بکەر دەبینەوە؛ ئەم جارە زاراوەکە دەلالەت دەکاتە سەر ئەو کەسەی خاوەن ئەو ڕوانگە و پیشەیەیە یان ئەو کەسەی بڕوای بە بنەواشەکانی ئەو قوتابخانەیە هەیە. لە شێوەی سێیەمدا، واتە ئیستیک، ڕووبەڕووی ئاوەڵناوێک دەبینەوە. بۆ ڕوونترکردنەوەی باسەکە با ئاوڕێک لەم نموونە سادەیەی خوارەوە بدەینەوە:

liberalism ئازادیخوازی

liberalist ئازادیخواز

liberalistic ئازادیخوازانە

بەڵام کێشەی وەرگێڕانی ئەم تاقمە زاراوەیە زۆر لەوەی سەرەوە قووڵترە. بە مەبەستی کردنەوەی دەلاقەیەک بۆ چوونە نێو باسەکە، دەتوانین هەوڵی پۆلێنکردنی مانا جیاجیاکانی ئەم پاشگرە بدەین و پاشان لەسەر وەرگێڕانیان چەند بیروڕایەک بخەینە ڕوو.

1. ئیزم لە یەکێک لە گشتیترین شێوەگەلی بەکارهێنانیدا بە مانای «خوازی» دێتە بەکارهێنان وەک ئەم زاراوانەی خوارەوە:

humanism مرۆڤخوازی

naturalism سروشتیخوازی

separatism جیاییخوازی

republicanism کۆماریخوازی

2. مەرج نییە لە هەر کوێ ئەم پاشگرەمان بینی خێرا بە پێی یەکێک لەو پاشگرانەی سەرەوە وەریبگێڕینەوە. بۆ نموونە، زاراوەی criticism بە هیچ شێوەیەک وەک ڕەخنەخواز یان ڕەخنەگەرا وەرناگێڕدرێ و بەڵکوو دەبێتە ڕەخنە یان ڕەخنەکاری. هەندێ لەو زاراوانەی کە ئەم خەسڵەتەیان تێدایە بریتین لە:

urbanism شارنشینی (نەک شارخوازی)

capitalism سەرمایەداری (نەک سەرمایەخوازی)

aphorism پەند، نەستەقبێژی (نەک پەندخوازی)

3. هەندێ جار ئیزم دەلالەت لە جۆرێک پیشە یان بواری پسپۆڕی دەکات. ئەگەرچی وا دەزانرێ ئەم پاشگرە لە زۆربەی شوێنەکاندا بە مانای خوازی بەکار دەبرێ، بەڵام پێویستە بڵێین کە ئەم پاشگرە لە زۆر شوێندا بەم مانایە بەکار نابرێ. بۆ نموونە، زاراوەی columnist لە گوتاری ڕۆژنامەوانیدا دەلالەت دەکاتە سەر ئەو کەسەی بە شێوەیەکی بەردەوام لە ڕۆژنامە یان هەفتەنامەیەکدا ستوون یان گۆشەیەکی بۆ دانراوە. کەواتە، لە کوردیدا دەبێتە گۆشەنووس یان ستووننووس. هەر بە هەمان شێوە، publicist بەو کەسە دەوترێ کە گوتەبێژی کەسایەتییەکی ناسراوە (زیاتر وەک هونەرمەندانی سینەما یان گۆرانیبێژان) کە ئەرکی ئاگادارکردنەوەی خەڵکی لە ئەستۆیە لە دوا چالاکی و یا خود بڕیارەکانی ئەو هونەرمەندە.

دیسانەوە، باشترین نموونە بۆ جۆراوجۆریی وەرگێڕانی ist بۆ سەر زمانی کوردی وشەی footballist ە؛ دیارە لێرەدا ناکرێ و ناشبێ ئەم وشەیە بە شێوەی فووتباڵخواز یان فووتباڵگەر وەربگێڕدرێتەوە. کەواتە، ئەم نموونە ئاشکرایە بەسە بۆ ئەوەی بزانین کە پێویستە زۆر بە وردی و وریاییەوە ڕووبەڕووی وەرگێڕانی پاشگری ism ببینەوە.

4. هەندێ جار باشتر وایە ئەم پاشگرە، وەک چۆن لەم نموونانەی خوارەوەدا دەیبینین، وەرنەگێڕدرێ و هەر بە هەمان شێوەی خۆی دابنرێتەوە. ئەم پاشگرە لەم حاڵەتەدا یان بە ناوێکی تایبەت و ناسراوەوە لکێندراوە یان کۆی زاراوەکە بە تەواوی لە ناو گوتەی ڕۆژانەدا جێکەوتووە و مانایەکی ئاشکراشی هەیە (لە حاڵەتی دووەمدا دەشکرێ وەربگێڕدرێن):

Marxism مارکسیزم

Freudism فرۆیدیزم

Epicureanism ئێپیکیوریزم

Buddhism بودیزم

socialism سۆسیالیزم

materialism ماتێریالیزم

5. دەشکرێ لە هەندێ شوێندا ئەم پاشگرە بە شێوەی «پەرستی» وەربگێڕدرێ. لە وەها حاڵەتێکدا ئەوا دەقاودەق و بە شێوەیەکی پاراو ماناکەی خۆی دەردەخات وەک لەم نموونانەی خوارەوەدا:

hedonism چێژپەرستی

racism ڕەگەزپەرستی

opportunist هەلپەرست

6. لە پاڵ ئەمەشدا، دەکرێ پاشگری ism هەندێ جار بەشێوەی باوەڕی وەربگێڕدرێ:

deism خواباوەڕی (جیایە لە خواپەرستی)

deist خواباوەڕ (جیایە لە خواپەرست)

dialogism وتووێژباوەڕی (یان مەنتیقی وتووێژ)

dialogist وتووێژباوەڕ (ئەو کەسەی بڕوای بە مەنتیقی وتووێژ هەیە)

7. ئەم پاشگرە هەندێ جار بە شێوەی «تەوەری» تەرجەمە کراوە کە ئەمەش دەقاودەق هەمان «محوری»یە لە زمانی فارسیدا. وەک چۆن لە فارسیدا بۆ زاراوەی درێدایی logocentrism کەڵک لە «کلام محوری» وەردەگیردرێ، وەرگێڕە کوردەکانیش هەندێ جار ئاخاوتەتەوەری یان گوتەتەوەری بەکار ئەهێنن. ئەم زاراوەیە دەکرێ بە شێوەی گوتەناوەندی یان گوتە بە ناوەندانان-یش تەرجەمە بکرێ.

8. پاشگری ئیزم یان ئیسم هەندێ جار دەلالەت لە جۆرێک نەخۆشی دەکات وەک مۆنگۆلیسم (mongolism) و یان سادیسم و مازۆخیسم.

9. دانانی «گەرایی» لە کوردیدا بۆ ئەم پاشگرە دروست نییە. گەرایی لە گرایش-ی فارسییەوە هاتووە و تا ئێستا ئێمە خاوەنی هاوواتایەکی پڕبەپێست نین بۆ ئەم وشەیە. ڕەخنەی توند لە بەکارهێنانی گەرا و گەرایی وەک پاشگری بۆ ئەم مەبەستە گیراوە. جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان خوازی و گەرایی و گەر لەبری یەکیان دابنێین لە مانای ڕاستەقینەی زاراوەکە دوور کەوتووینەتەوە. هەروەهاش، دوو پاشگری گەری و گەرایی بە تەواوی لە یەکتر جیاوازن. پاشگری گەری لە بنەڕەتدا و لە شێوە کاربردی ڕۆژانەماندا بە مانای کار و پیشە دێتە بەکارهێنان. گەری و گەرێتی یەکێکن و زیاتر بۆ پیشە و خوو و ڕەوشت بە کار دەبرێن. ئەم دوو پاشگرە لە کار و کەر نزیکن و هیچ پێوەندییەکیان بە «گرایش»-ی فارسییەوە نییە:

**ئاسنگەری، خوێڕیگەری، ناوچەگەری (ناوچەگەرێتی)، شانۆگەری، نەشتەرگەری.**

دوو زاراوەی تازەگەری و سۆفیگەری لەو ڕێسایانەی سەرەوە پێڕەوی ناکەن، بەڵام لە زمانی کوردیدا بە تەواوی جێکەوتوونە. سۆفی کەسە نەک پیشە و خوو و ڕەوشت (ئەم زاراوەیە لە فارسیشدا هەیە و بە شێوەی سۆفیگەری سەرەتا لە لایەن ئەحمەد کەسرەوی-یەوە بە کار هێنرا). لە لایەکی تریشەوە، تازەگەری هەمان نوێخوازی-یە کەچی تازەگەری زیاتر بە مانای کرداری تازەکردنەوەی شتێک بەکار دەبرێ و نوێخوازی زیاتر خواستی نوێکردنەوەی لە هەناویدا هەڵگرتووە. لە لایەکی ترەوە، تازە و نوێ لە مۆدێرن جیاوازن چونکە تازە و نوێ بەردەوام ئامادەن، کەچی مۆدێرن دەشتوانێ دەلالەت بکاتە سەر سەردەمێکی دیاریکراو. ئەگەر باسی فەلسەفەی مۆدێرن بکرێ، ئەوا مەبەست سەدەی هەڤدەهەمە تا کۆتایی سەدەی نۆزدە و ئەگەر باسی بزووتنەوەی مۆدێرنیزم (modernism) لە هونەر و ئەدەبی ڕۆژئاوا بکرێ، مەبەست ماوەی نێوان ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەمە.

١٠. هەندێ لەو زاراوانەی بە ئیزم-ەوە کۆتاییان دێ، با ئەگەر واتای پەرستی، تەوەری، مەڵبەندی، یاخود باوەڕی-یش لە هەناویاندا حەشار درابێت، لە کوردیی ئەمڕۆدا هەر بە خوازی-یەوە دادەنرێن، وەک:

historicism میژوویی‌خوازی
naturalism سروشتی‌خوازی
individualism تاک‌خوازی
empiricism ئەزموونخوازی
westernism رۆژئاوایی‌خوازی
skepticism گومانخوازی

### ٣٦. بنەما، بونیاد، بنیات، یان پێکهاتە؟

وشەی بنەما لە لایەن هەندێ کەسەوە لەبری بونیاد دانراوە. بونیاد هەمان بنیاتە، بەڵام ئەوڕۆکە زیاتر بە شێوەی جیاواز بەکار ئەهێنرێ. بنیات لە بنەڕەت نزیکە و هەر بۆیەش بنیاتخوازی یان بناژۆخوازی بۆ fundamentalism و بنەڕەتخوازی بۆ essentialism بەکار ئەهێنم. لە باشوور بونیادگەری بۆ structuralism بەکار ئەهێنن کە کاریگەریی عەرەبیی پێوە دیارە. وێڕای ئەمەش، بەکارهێنانی گەری و گەرێتی دروستە ئەگەر وەک پاشگر بن بۆ دەرخستنی کار و پیشە و هەڵسوکەوت، بەڵام کە دەوترێ بونیادگەری، یەکسەر هەڵەیە چونکە ئەو بیرمەندە پیشەی یان ڕەوشتی «بونیاد» نییە، بەڵکوو «گرایش» واتە خوازیاری و داگەڕانی هەیە بەرەو ڕوانین و ڕووبەڕووبوونەوەی دیاردە و بابەتەکان بە شێوەیەکی پێکهاتەیی. گەری و گەرێتی لە «گرایش»ەوە وەرنەگیراون تا لە ناوی ڕێبازە فیکرییەکاندا بەکاریان بەرین. بۆیەش هاوواتاکان بەم شێوەیەی خوارەوە دادەنرێ:

structure پێکهاتە
structural پێکهاتەیی
structuralism پێکهاتەیی‌خوازی
structuralist پێکهاتەیی‌خواز

## ٣٧. هاوواتای کوردیی «گرایش»

«گرایش»ی فارســی لە ئینگلیزیدا بە شـێوەی tendency و orientation دەردەکەوێ. چەند ســاڵ لەمەوبەر کە گۆڤاری *دەق*-مان دەردەکرد، لە زاراوەی خوازیاری بۆ ئەم مەبەســتە کەڵکمان وەردەگرت؛ هەرچەند هەر ئەوکاتەش دەمانزانی خوازیاری مانایەکی تریشـــی هەیە، بەڵام چار نەبوو. لە چاپەمەنییەکانی کوردســـتانی عێراقدا بۆ ئەم وشـــەیە ئینتیما بەکار ئەهێنرێ کە عەرەبییە. لە سەفەرێکدا بۆ دهۆک لە ساڵی 2000دا و دیدار لەگەڵ یەکێتی نووسەراندا ئەم پرسیارە

م لێ کردن و وڵامیان دامەوە بۆ «گرایش» ژێیاتی بەکار دەبەن. لە لایەکی ترەوە، هەندێ کەس وای بۆ دەچن لە کوردیدا گیرۆدەیی لە ڕووی ڕیشـەناسـییەوە لە «گرایش» نزیکە کە دروست نییە و تەنها واتاکەیان یەک تۆز وێکچووە. لە شێوە باو و ئاساییەکەیدا وەک ئۆگری، داشــکانەوە، حەز، خواســت، مەرام، ئاراســـتە و ڕاکێشـــان بەکار ئەهێنرێ، بەڵام لە زمانی تەکنیکیدا وەک لایەنگری و داگەڕان بەکاری ئەبەین.

## ٣٨. سۆفی و سۆفیگەری، عارف و عێرفان

لە زۆربەی فەرهەنگە ئینگلیزی-کوردییەکاندا و تەنانەت لە فەرهەنگە ئینگلیزی-فارسییەکانیشدا لە بەرامبەر وشەی mysticدا نووسراوە عارف یان سۆفی. هەر بە هەمان شێوە، بۆ mysticism نووسراوە «عرفان» یان سۆفیگەری. بەڵام ئەم هاوواتا فارسی و کوردیانە نادروستن. میستیسیزم چ وەک قوتابخانەیەک و چ وەک ڕوانگەیەک بۆ جیهان و چ وەک جۆرێک لە ژیان و کردار هەڵگری هەندێ ماک و و تایبەتمەندییە کە بە هیچ جۆرێک لە «عرفان» و سۆفیگەریدا نابیندرێن. بە پێچەوانەشەوە، «عرفان» و سۆفیگەری هەڵگری چەندین تایبەتمەندین کە بە هیچ شێوەیەک لە میستیسیزمدا نابیندرێن. میستیسیزم و «عرفان» یان میستیسیزم و سۆفیگەری یەکێک نین و هەر بە هەمان شێوەش عارف یان سۆفی، میستیک نییە. میستیسیزم هەندێ جار هەڵگری چەند تایبەتمەندییەکە کە لە سیحر و جادوو نزیکی دەکاتەوە. هەر بە هەمان شێوەش، میستیک هەندێ جار بەو کەسە دەوترێ شێوەژیانێکی سیحراوی و سەیر و سەمەرەی هەیە کەچی لە عیرفانی ئیسلامیدا عارف و سۆفییەکان بە تەواوی لە ڕەهەندە سیحراوییەکان دوورەپەرێز بوونە. «عرفان» و سۆفیگەری لەگەڵ میستیسیزم

هەڵگری چەندین خاڵی ناتەبا و جیاوازن کە ئێرە شوێنی باس کردنیان نییە. هەر بۆیەش، میستیسیزم لە عەرەبیدا بە شێوەی «غموضیه» دێتە بەکارهێنان کە لە «عرفان» و «تصوف» جیایە.

لە لایەکی تریشەوە، عارف لە سۆفی جیاوازە و کەواتە «عرفان»یش لە سۆفیگەری جیایە. بە داخەوە، لە زۆربەی هەرە زۆری دەق و نووسینە کوردییەکاندا دوو زاراوەی عارف و سۆفی وەک یەک دانراون و ئەمەش تا ئەو ڕادەیەی ئەوڕۆکە لە زمانی کوردیدا زاراوەی «عرفان» خەریکە پەیتا پەیتا جێگای خۆی دەبەخشێتە سۆفیگەری. هەموو عارفێک سۆفییە بەڵام مەرج نییە هەموو سۆفییەک عارف بێ چونکە یەکێک لە پلە و قۆناغەکانی «عرفان» سۆفیگەرییە. ئەم جیاوازییە بە تەواوی و بە شێوەیەکی دروست لە زمانی فارسیدا ڕەچاو دەکرێ؛ واتە لە فارسیدا «تصوف» لە عرفان جیایە وەک چۆن «صوفی» لە عارف جیاوازە. لە کوردیدا، هەر دوو زاراوەکە بە شێوەی سۆفیگەری وەردەگێڕدرێ کە ئەمە هەڵەیە و خەریکە دەبێتە شتێکی گشتی و گشتگیر لە زمانی کوردیدا و هەربۆیەش پێویستە بە پارێزەوە و بە وردی کەڵک لە دوو زاوارەی جیاوازی «عرفان» و سۆفیگەری وەربگرین.

لە زمانی ئینگلیزیدا بۆ سۆفی sufi دانراوە و بۆ سۆفیگەری sufism. بۆ عارف mystic دانراوە و بۆ «عرفان» mysticism. هاوواتای سۆفی و سۆفیگەری لە زمانە ئەوروپییەکاندا دروستە بەڵام، وەک پیشانمان دا، هەمووان بە شێوەیەکی هەڵە هاوواتای دوو زاراوەی عارف و «عرفان» بەکار ئەهێنن. خاڵی هەرە سەیر لێرەدا لەوەدایە کە جگە لەم بەکارهێنانە هەڵەیە ڕێگەیەکی ترمان لەبەر دەستدا نییە بۆ وەرگێڕانی ئەم چەمکە؛ ئەمەش بە ئاشکرا جیاوازیی دوو سیستەمی ئایینی و فەرهەنگیی تەواو جیاواز دەردەخات بە شێوەیەک کە ناتوانین هاوواتایەکی پڕبەپێست و تەواو دروست بۆ چەمکێک لە هەر دوو زمانەکەدا بدۆزینەوە. تەنها ڕێگایەک لە بەردەمماندا بێ ئەوەیە کە لە زمانی مەبەستدا هەمان زاراوەی زمانی سەرچاوە بەکار بهێنینەوە، واتە mysticism بە شێوەی میستیسیزم و «عرفان» بە شێوەی erfan یان irfan بنووسین.

## ٣٩. پاشگری «ێتی»

یەکێک لە خاڵە چونیەکەکانی فارسی و عەرەبی و کوردی لە لایەکەوە و ئینگلیزی و فەرەنسی لە لایەکی ترەوە بەکارهێنانی کۆمەڵێ پاشگری هاوشێوەیە بۆ سازکردنی ناو بە گوێرەی ئاوەڵناو، وەک یت و ێتی و ity و ite. ئەم وێکچوونییە خاڵێکی سەیرە چونکە شێوەی دەربڕین و دەوری ڕێزمانیی ئەم پاشگرە لەو زمانانەدا لێکدی نزیکن. ئەو وشانەی لە زمانی فارسیدا لەم چەشنەن و بە پاشگری «یت» کۆتاییان پێدێ بە «مصدر جعلی» ناسراون، واتە چاوگی ساختە. هۆکاری ئەم ناولێنانەش ئەوەیە کە ئەم خەسڵەتەی زمانی فارسی بە تەواوی لە عەرەبییەوە وەرگیراوە. هەندێ لەم وشانە لە فارسی و عەرەبیدا بریتین لە: فردیت، منیت، مدنیت، عقلانیت، واقعیت، انسانیت، علیت. گەر لە کوردیشدا چەند نموونەیەک بهێنینەوە ئەمانەن: شارستانێتی، شارستانییەت، تاکایەتی، چەندایەتی و مرۆڤایەتی. ئەم وشە و زاراوانە هەموویان لە ڕووی ڕێزمانییەوە ناون کەچی وەک دەزانرێ هەندێکیان لە زمانی کوردیدا بە شێوەیەکی هەڵە وەکوو ئاوەڵناو بە کار ئەهێنرێن. دیارە مامۆستا مەسعوود محەمەد بە وردی لەم خاڵە تێگەیشتبوو چونکە ئەو بە پێچەوانەی هەموو کوردێکەوە ئەو «کۆمەڵایەتی»ی وەک ناو بەکار ئەهێنا نەک وەکوو ئاوەڵناو. نموونەیەکی تری زەقی ئەم چەوت بەکارهێنانە کە ئێستاشی لەگەڵدا بێ بەردەوام دووبارە دەبێتەوە ناونیشانی یەکێک لە کۆلیژەکانی زانکۆی سلێمانییە کە ئەویش کۆلێژی زانستە مرۆییەکانە نەک کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکان. خاڵی سەیرتر لەوەدایە کە ئەم هەڵەیە لە کۆلێژێک ڕووی‌داوە کە سەروکاری لەگەڵ فەرهەنگ و سیستەمە فەرهەنگییەکاندایە. هەندێ لە نموونەکان لە ئینگلیزیدا و هاوواتاکانیان لە فارسی و کوردیدا بریتین لە:

individuality فردیت، تاکایەتی

humanity انسانیت، مرۆڤایەتی

rationality عقلانیت، عەقڵانییەت

modernity مدرنیتە، مدرنیت، مۆدێرنیتە، مۆدێرنێتی

causality علیت، هۆدارێتی

civility مدنیت، مەدەنیەت

quality کیفیت، چۆنایەتی

کمیت، چەندایەتی quantity

مسئولیت، بەرپرسیارێتی responsibility

**٤٠. نووس و نڤیس**

«نووس» لە چەندین وشە و زاراوەی جیاواز لە ڕووی ڕێزمانییەوە دەردەکەوێ. ئەگەر لە دوو وشەی ڕۆماننووس و گۆشەنووسدا دەلالەت لە پیشەی ڕۆماننووسین و گۆشەنووسین دەکەن، لە وشەی ڕۆژنامەنووسدا ئیدی مانای ڕۆژنامەنووسین بزر دەبێ؛ واتە، دەکرێ بڵێین ئەو خەریکە ڕۆمان دەنووسێ، بەڵام گەر بڵێین ئەو خەریکە ڕۆژنامە دەنووسێ، لە باری ماناییەوە نائاسایی دێتە بەرچاو. هەر بە هەمان شێوە، لە وشەی خۆشنووسدا خۆش ناو نییە و بەڵکوو ئاوەڵکردارە، واتە ئەو کەسەی بە شێوەیەکی خۆش و جوان دەتوانێ بنووسێ. تەواو بە پێچەوانەوە، لە دەستنووس و ڕەشنووس و کۆنووسدا مانایەکی تەواو جیاواز بەدی دەکرێ؛ لێرەدا ئەم زاراوانە چیدی ناوی بکەریان دروست نەکردووە و دەلالەت ناکەنە سەر کەس و بەڵکوو تەعبیر لە شت دەکەن.

بەشێک لە هۆکاری سەرهەڵدانی ئەم کێشەیە لە بەراورد لەگەڵ زمانی فارسیدا لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لەم جۆرە کاتانەدا کرداری نووسین لە زمانی فارسیدا بە سێ شێوەی «نوشت»، «نویس» و «نگار» دەردەکەوێ، کەچی هەر ئەم کردارە لە زمانی کوردیدا لە هەر سێ حاڵەتەکەدا بە شێوەی نووسین وەدیار دەکەوێ. لە فارسیدا «وبنوشت» لە «وبنویس» جیایە. «وبنویس» ئەو کەسەیە کە لە وێب یان ماڵپەڕێکدا دەنووسێ و «وبنوشت» ئەو بابەتەیە کە لە وێبدا دەنووسرێ. لە کوردیدا هەر سێکیان دەبنە نووس. بۆ نموونە، «روزنامەنگار»ی فارسی دەبێتە ڕۆژنامەنووس و «خوشنویس» دەبێتە خۆشنووس. لە گەردانی کاری کوردیدا هەموو نووس-ەکانی کاتی ئێستا لە فارسیدا دەبنە «نویس» و هەموو نووس-ەکانی ڕابردوو دەبنە «نوشت». هەر بۆیەش، هەر دوو «دستنوشتە» (یان «دستنبشتە» لە فارسیی ئارکەیکدا) و «دستنویس»ی فارسی لە زمانی کوردیدا دەبنە دەستنووس. لە فارسیدا هەندێ جار جیاوازیی نێوان «نوشت» و «نویس» کەم دەبێتەوە و تەنانەت لە ناو دەچێ وەک جیاوازیی نێوان «روزنوشت» و «روزنگار» («روزنگار» هەمان «روزنویس»ە).

دەکرێ سەرجەم ئەو وشە و زاراوانەی نووس-یان تێدایە بە سەر سێ دەستەی جیاوازدا پۆلێن بکەین: یەکەم، ئەو وشانەن کە ناوی بکەرن و دەلالەت دەکەنە سەر پیشە یان بواری پسپۆڕیی کەسێک یان شێوە و شێوازی نووسینی کەسێک وەک:

وێبلاگ‌نووس، ماڵپەڕنووس، کتێبنووس، وتارنووس، نامیلکەنووس، دۆعانووس، سادەنووس، دژوارنووس، ئاڵۆزنووس، ڕۆژنامەنووس، چیرۆک‌نووس، ڕۆمان‌نووس، شانۆنامەنووس، یاداشتنووس، پەراوێزنووس و خۆشنووس. دەستەی دووەم ئەو وشانەن کە دەلالەت دەکەنە سەر شت یان ئامێرێک وەک پێنووس (یان وەک چۆن لە فارسیدا «دورنویس» بۆ ئامێری فەکس بەکار ئەهێنرێ). دەستەی سێیەم ئەو چەمکانەن کە وەک ناوێکی تێکەڵاو بوونەتە خاوەنی واتایەکی تایبەت وەک چارەنووس، ڕێنووس، دەستنووس، کۆنووس و ڕەشنووس (ڕەشنووس هەمان «پیشنویس»ی فارسییە کە هەمان «مسودە»ی عەرەبییە). لە کورمانجیدا بۆ نووس کەڵک لە نڤیس وەردەگیردرێ و دەکرێ لەو وشە و زاراوانەی سەرەوەشدا بەکار بهێنرێ.

## ٤١. سەرنووسەر یان سەرنووسیار؟

لە زمانی فارسیدا بۆ سەرنووسەر «سردبیر» بەکار ئەبرێ و ئەمەش هاوتایەکی ڕاست و دروستە بۆ editor-in-chief لە ئینگلیزیدا. ئەو کەسەی بەرپرسە لە هەڵبژاردن و دانانی بابەتەکانی ڕۆژنامە و گۆڤار نابێ بە سەرنووسەر پێناسە بکرێ. واتای ئەم وشەیە نەک هەر لە زمانەکانی فارسی، ئینگلیزی و فەرەنسیدا نییە بەڵکوو تەنانەت ئەگەر وشەیەکی لەو چەشنە لەو زمانانەدا دابهێنین یان بەکاری بەرین، ئەوا ئەو کارەمان دەبێتە مایەی سەرسووڕمان. سەرنووسەر لەوانەیە هەر نووسەریش نەبێ تا چ بگاتە ئەوەی سەرنووسەر بێ. ئەو کەسە لەوانەیە گۆشەنووس یان ڕۆژنامەنووس بێ. وێڕای ئەمەش، هەر نووسەرێک خاوەن بەرهەم و جیهانبینیی خۆیەتی و وەک تاکێکی سەربەخۆ دادەنرێ و ناکرێ سەرکردەیەکیان بۆ دابنرێ! تەنانەت ئەو کەسەش کە بنیاتنەری قوتابخانەیەکی ئەدەبی یان فیکرییە پێی ناوترێ سەرنووسەر چونکە هەر یەک لە ئەندامانی ئەو قوتابخانەیە خاوەن شێوازی تایبەتی نووسین و بیرکردنەوەی خۆیەتی. چەند ساڵ بەر لە ئێستا ئەم بابەتەم لەگەڵ بەرپرسانی دەزگای ئاراس باس‌کرد و ئێستا هەندێک لە کۆوارەکان کەڵک لە زاراوەی سەرنووسیار وەردەگرن کە ڕۆنانێکی دروستە چونکە سەرنووسیار هەڵگری واتا نادروستەکانی سەرنووسەر نییە. بێجگە لەمانەش، خودی نووسیار دەکرێ بۆ ئێدیتۆریش بەکار ببرێ. وەک ئەوەی لەبری دەستەی نووسەران بڵێین دەستەی نووسیاران. ئێدیتۆر کۆمەڵێ هاوواتای تریشی هەیە وەک هەڵەگر و هەڵەچن و یاخود وەک بەرهەڤکار.

## ٤٢. نڤیسار

زاراوەی «نوشتار»ی فارسی کە لە ئینگلیزیدا گەرچی وەک writing بەکار دەبرێ، بەڵام زۆر جار لە دەقە پسپۆڕانەکاندا کەڵک لە ecriture وەردەگیردرێ کە فەرەنسییە. دیارە هۆکاری بەکارهێنانی ئەم زاراوە فەرەنسییە لە زمانی ئینگلیزیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زاراوەی writing لە ئینگلیزیدا ناتوانێ خاوەنی دەلالەتەکانی ecriture ی فەرەنسی بێ. هەربۆیەش، ئێمە زاراوەی نڤیسار بۆ ئەم مەبەستە دەکار دەگرین، ئەگەرچی بۆ ماوەیەکیش «نووسینە»مان بەکار دەهێنا. ئەم زاراوەیە لە زمانی فەرەنسیدا لە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەدا دەمانخاتەوە بیر دەق یان پارچەیەکی نووسراو، کەچی لە تیۆریی فەرهەنگی و ئەدەبیی هاوچەرخدا، کە ئەم زاراوەیەی تێدا بە لێشاو بەکار دەهێنرێ، ماناکەی دەگۆڕدرێ و لێرەدا مەبەست لە «نوشتار» یان ecriture کۆی ئەو بەرهەمانەن کە گوتارێکی تایبەت خولقاندوونی؛ بو نموونە، دەستەواژەی "نوشتار فمنیستی" یان نڤیساری فێمینیستی بۆ Ecriture Feminist بەکار ئەهێنین. ئەگەر بۆ زاراوەی Ecriture Marxist نووسراوەی مارکسیستی یان نووسینەی مارکسیستی بەکار بهێنین، مانا و کاربردی زاراوەکەمان نەپێکاوە و باشتر وایە کەڵک لە زاراوەی نڤیساری مارکسیستی وەربگرین کە لە فارسیشدا بە شێوەی «نوشتار مارکسیستی» دێتە بەکارهێنان.

## ٤٣. زانست و زانیاری، زانا و زانیار

یەکێک لەو هەڵانەی بەردەوام گوێبیستی دەبین بەکارهێنانی ئەو وشە و مۆرفیمانەیە لە کرداری زانین-ەوە چێ‌کراون وەک زانست، زانیار، زانیاری، زانا، زان و زانی. زانست، واتە «علم» یان science لق یان بوارێکی پسپۆڕانەیە و لە زانکۆ دەخوێندرێ و تێیدا زانیاری واتە «دانش» یان knowledge بەرهەم دەهێنرێ. لەدایکبوون یاخود بووژانەوەی زانیاری لە ڕێگەی بەرهەمهێنانی زانستییەوە سەر دەگرێ؛ لە لایەکی ترەوە، بەکارهێنانی زانا بۆ scientist ئەمڕۆکە لە کوردیدا بۆتە باو و لە جیاتی «عالم» یان «دانشمند» بەکار دەبرێ کە دروست نییە. بەکارهێنانی زانا بۆ scientist جۆرێکە لە کورتوکۆکردنەوەی واتای سەرەکیی ئەم وشەیە و تا ڕادەیەک بۆتە هۆی دابەزینی ئاستی ڕاستەقینەی واتایی وشەکە، وەک چۆن دەوترێ زانایانی ئەستێرەناسی یان زانایانی بواری کیمیا. بەکارهێنانی زانا لەم دەستەواژانەدا دیسانەوە هەمان ڕەهەندی ساکارسازی-مان وەبیر دەهێنێتەوە کە لە زمانی کوردیدا و و لەبەر

هۆکاری ئاشکرا و لەسەر دەستی چەند نووسەرێکی سەردەمانی ڕابردووەوە ئامادەبوونی هەیە و لە ئەنجامدا زەینییەتێکی ساکارسازانەی بۆ سوژەی کوردی بەرهەمهێناوەتەوە.

ڕاستە زانیار خاوەنی زانیارییە و زانیارییش لە زانست جیایە، بەڵام هەر ئەم حاڵەتەش لە فارسیدا ڕووی داوە و «دانشمند»، وەک وەرگێڕانی scientist، پسپۆڕی بوارێکی «علمیَ»ە نەک خاوەنی زانیاری؛ ئەمەش نزیکیی زۆری «علم» و «دانش» دەردەخات. لە کوردیدا دەکرێ زانستمەند دروست بکرێ، وەک بیرمەند. بەم کارەشمانەوە ئەو هەڵەیەی زمانی فارسیمان دووبارە نەکردۆتەوە چونکە وەرگێڕانی وشە بە وشەی «دانشمند» لە کوردیدا دەبێتە زانیاریمەند کە ڕۆنانێکی هەڵەیە و کەسیش بەکاری ناهێنێ. زانا لە زمانی کوردیدا هەمان «دانا»یە لە فارسیدا. بە سەرنجدان بە مانای جیاوازی کرداری to know لە فارسی و کوردیدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئەم کردارە لە کوردیدا خاوەنی دوو مانایە کە بریتین لە زانین و ناسین. ئەم دوو کردارەش لێکدی جیاوازن، کەچی لە هەندێ دەستەواژەدا لەبری یەک بەکار دەبرێن. بۆ نموونە لە دەروونناسی-دا، (psychology) پاشگری logy بە مانای ناسینە نەک زانین و کەواتە بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە بە شێوەی دەروونزانی هەڵەیە. هەر بە هەمان شێوە، پێویستە لە بری زیندەوەرزانی لە زیندەوەرناسی کەڵک وەربگرین. کەواتە، دەبێ لەجیاتی دەستەواژەی زانایانی بواری زیندەوەرزانی لە زانیارانی بوارای زیندەوەرناسی، زانستمەندانی بواری زیندەوەرناسی، یان زانستکارانی بواری زیندەوەرناسی کەڵک وەربگیردرێ. گەرچی بە ڕواڵەت لە یەک نزیکن بەڵام جیاوازیی وردیشیان لە نێواندایە.

یەکێکی تر لە داهێنانە کۆمیکەکانی ئەم چەند ساڵەی دوایی و لەسەر دەستی چەند نووسەرێک بریتییە لە بەکارهێنانی وشەی فرەزان وەک هاوواتا بۆ «فرزانە» یان «دانشمند». دیارە ئەم وشەیە نەیتوانی و ناشتوانێ ئەو مانایە بپێکێ چونکە وەک دەزانرێ فرەزان لە کوردیدا خاوەن دەلالەتێکی یەکسەر جیاوازە و لە بەستێنێکی زانستیدا بە کار نابرێ. ئەمڕۆکە لە زمانی ئینگلیزیدا science تەنها دەلالەت دەکاتە سەر بوارە جیاجیاکانی زانستە سروشتی و ئەزموونییەکان وەک فیزیا، کیمیا، بیرکاری، زیندەوەرناسی و زەویناسی. هەر بۆیەش زانست لە زمانی ئینگلیزیدا بۆ بەشێکی زۆر لە لقەکانی زانستە مرۆییەکان بەکار ناهێنرێ.

## ٤٤. نیچە یان نیتشە؟

دروستنووسینی ناوی کەسەکان و چەمکەکان نیشانەی هۆشیاریی زمانناسانەیە. زۆر جار دەبینین ناوی شاعیران و فیلسووفانی تەنانەت هەرە دیار بە شێوەیەکی هەڵە دەنووسرێ و هۆکەشی زیاتر کاریگەریی زمانی عەرەبییە. بۆ نموونە، نووسەری کوردمان هەیە کە چەندین ساڵە لە ئاڵمانیا دەژی کەچی ئێستاکەش لەبری نیچە دەنووسێ نیتشە. ئەمە لە لایەکەوە دەسەڵاتی دەقە عەرەبییەکان بە سەر ئەم نووسەرەوە دەردەخات و لە لایەکی تریشەوە پیشاندەری ئەوەیە ئەگەری زۆرە نووسەرەکە هەر گوێبیستی ئەم زاراوەیە بە ئاڵمانی نەبووبێ. نموونەیەکی تر ناوی ویتگنشتاین-ە. بەم دواییانە نووسینێکم بینی بە ناوی ڤیتگنشتاین و بەدیۆ! ئایا نووسەری ئەو دەقە هەر سەرنجی ئەوەی داوە کە ویتگنشتاین بە W دەنووسرێ نەک بە V؟ ئاخۆ بڵێی نووسەر ناوی ئەو فیلسووفەی لە دەقە ئینگلیزی و فەرەنسییەکاندا دیتبێ؟ نموونەکانی تر بریتین لە هوسرێل لەبری هوسێرل، فێردیناند لەبری فێردینان، بۆردۆل لەبری بۆردوێ، بارت لەبری بارێت.

## ٤٥. کۆمەڵ، کۆمەڵگا، جڤاک، جڤات

پرسی جیاوازییەکانی نێوان کۆمەڵ و کۆمەڵگا بە دەستپێکی باسێکی گرنگ و وردەکارانە دادەنرێ کە پێوەندیی بە کۆمەڵێک پرسی کۆمەڵناسانەوە هەیە. دیارە لەم ڕستەیەدا کۆمەڵ-م بە مانای کۆمەڵگا بە کار نەهێناوە و کۆمەڵ لە کوردیدا گەلەگ مانای تریشی هەیە. هەر بۆیەش من دەبوایە بڵێم ئەم باسە پێوەندیی بە کۆمەڵێک پرسی کۆمەڵگاناسانەشەوە هەیە. ئەمە هەڵەیەکە هەمووان بەو شێوەیە زاراوەکە بەکار ئەهێنن. دروستتر ئەوەیە بڵێین کۆمەڵگاناسی کەچی دەڵێین کۆمەڵناسی و ئەمەش جێکەوتووە و منیش هەر بە هەمان شێوە بەکاری دەبەم. دیارە کۆمەڵ لە کۆمەڵگا جیایە وەک چۆن community لە society جیاوازە. ئەم جیاوازییە لە زمانی فارسیشدا لە نێوان «اجتماع» و «جامعە»دا هەیە کە زۆرێک لە نووسەرە فارسەکانیش سەرنجی نادەنێ؛ واتە زۆر جار لە بری «جامعە» کەڵک لە «اجتماع» وەردەگرن. بنەڕەتی ئەم کێشەیە بەر لەوەی زمانناسانە بێ، کۆمەڵناسانەیە.

له کۆمەڵناسیدا جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان کۆمیۆنێتی (کۆمەڵ) و سۆسایێتی (کۆمەڵگا)دا. کۆمیۆنێتی لە بەستێنێکی پێش‌مۆدێرندا بەکار ئەبرێ و سۆسایێتی بۆ پێناسەی کۆمەڵگای مۆدێرن دێتە بەکارهێنان. لێرەدا دەبێ سەرنج بدرێتە تیۆرییە کۆمەڵناسانەکانی بیرمەندی ناسراوی بواری فەلسەفەی کۆمەڵایەتی و ناسیۆنالیزم ئێرنێست گێلنێر و ڕوانگەکانی لەسەر جیاوازیی نێوان کۆمیۆنێتی و سۆسایێتی. دەکرێ بڵێم ئەوەی لە شار و شارۆچکە و گوندەکانی کوردستاندا دەیبینین تێکەڵاوێکە لە کۆمەڵ و کۆمەڵگا. ئەگەرچی لە شارە گەورەکانی کوردستاندا تا ڕادەیەک هەست بە هەبوونی سۆسایێتی دەکەین، هەر بە هەمان شێوەش، لە گوندەکاندا و تەنانەت لە شارەکانیشدا ئەوەی دەیبینین کۆمیۆنێتی-یە. بە واتایەکی ڕوونتر، لە هەر کوێ خەسڵەت و یاساکانی کۆمەڵگای مەدەنی و مۆدێرن لە ئارادا بوو، ئەو شوێنە سۆسایێتی-یە نەک کۆمیۆنێتی؛ هەر بە هەمان شێوەش، لە هەر شوێنێک خەڵک بە شێوەی سوننەتی و پێش‌مۆدێرن ژیان ببەنەسەر، ئەوە کۆمیۆنێتی یە نەک سۆسایێتی. لە کوردستاندا بە هۆی پارچەپارچەبوونی ئەم پۆلێنکاریانەوە ناتوانین بڵێین شار یان گوندێک بە تەواوی سۆسایێتی-یە یان کۆمیۆنێتی. لەوانەیە لە قوتابخانەی گوندێکی کوردستاندا بە هۆی ڕەچاوکردنی یاساکانی وەزارەتی پەروەردەوە سۆسایێتی هەبێ کەچی لە هەمان گوندا شێوەی خوازبێنی و هاوسەرگیری وامان لێ بکا بڵێین ئەو گوندە کۆمیۆنێتی-یە نەک سۆسایێتی. لە شارەکانی کوردستانیشدا، هەر بە هەمان شێوە تێکەڵاوییەک لە سۆسایێتی و کۆمیۆنێتی لە ئارادیە. لە کورمانجی کەڵک لە جڤات یان جڤاک وەردەگیردرێ کە یەکێکن و لە بادینیدا جڤات لەبری جڤاک بەکار دەبرێ. لە کوردیی سەروودا بۆ کۆمەڵناسی جڤاکناسی دادەنرێ و منیش لەم فەرهەنگەدا بەکارم هێناوە. جیاوازیی وردی نێوان کۆمەڵ و کۆمەڵگا کەمتر لە بەرهەمی نووسەرانی کورمانجی‌نووسدا سەرنجی دراوەتێ و جڤات و جڤاک بە مانای کۆمەڵ، کۆمەڵگا، گروپ و دەستە بەکار دەبرێ.

### ٤٦. «قیاس» و «استقرا»: دەرئەنجام و بەرئەنجام

لێرەدا مەبەست پێناسە و شیکاریی ئەم دوو شێوە و بۆچوونە جیاوازە نییە لە فەلسەفە و مەنتیقدا، بەڵکوو مەبەست وەرگێڕانی دروستیانە بۆ کوردی. «قیاس» یان deduction لە کوردیدا دەکرێ بە شێوەی دەرئەنجامگیری دابندرێ. دەرئەنجامگیری یان بەڵگاندنی دەرئەنجامگیرانە (deductive reasoning) بریتییە لەو شێوە بەڵگاندنەی کە تێیدا لە گشتەوە

دەگەیینە پاژ و، ئەگەر پێشەکییەکان دروست بن، ئەوا دەرئەنجامەکەش دروستە. بە واتایەکی تر، دەرئەنجامگیری، بەدەستهێنانی گوزارەیەکە لە چەندین گوزارەی تر. هەر کاتێ دوو یان چەندین گریمانەمان وەکوو دروست دانا و پێوەندیی نێوان ئەم گریمانانەش بە شێوەیەک بێ کە لەم گریمانە دروستانەوە بگەیینە ئەنجامێکی مەنتیقی، ئەوا دەبێ ئەو ئەنجامە بە دروست لە قەڵەم بدەین. بۆ نموونە، ئەگەر پێشگریمانەی یەکەم بریتی بێ لە «مانگ هەسارەیە» و پێشگریمانەی دووەم بریتی بێ لە «هەسارە دەسووڕێتەوە»، بە گوێرەی شێوەی بەڵگاندنی دەرئەنجامگیرانە، گوزارەکە بریتییە لە «مانگ دەسووڕێتەوە». نموونەگەلی ئاشکرای ئەم بەڵگاندنە بریتین لەو نموونانەی ئەرەستوو لە کتێبی *ئۆرگەنۆن* ئاماژەیان بۆ دەکات. ئەرەستوو لەم کتێبە کاریگەرەی زانستی مەنتیقدا باس لەم دوو جۆرە بەڵگاندنە جیاوازە دەکات. نموونەی هەرە ناسراوی بەڵگاندنی دەرئەنجامگیرانە ئەمەیە: هەموو مرۆڤەکان دەمرن، سوقرات مرۆڤە، کەواتە، سوقرات دەمرێ.

لە لایەکی ترەوە، «استقرا» یان induction دەکرێ لە کوردیدا وەک بەرئەنجامگیری بەکار بهێنرێ. لە بەڵگاندنی بەرئەنجامگیرانەدا (inductive reasoning) لە ئاوڕدانەوە لە پاژەکانەوە دەگەیین بە بەرئەنجامێکی گشتی. ئەگەر پێشەکییەکان دروست بن، ئەوا بەرئەنجامەکەش بە تەواوی دروستە. بە پێی ئەم خشتەکارییەی خوارەوە جیاوازیی نێوان ئەم دو شێوە فەلسەفەییە باشتر دەردەکەوێ:

| بەڵگاندنی بەرئەنجامگیرانە | بەڵگاندنی دەرئەنجامگیرانە |
|---|---|
| تیۆری | تیۆری |
| ↑ | ↓ |
| گریمانە | گریمانە |
| ↑ | ↓ |
| ئولگوو | ئاوڕدانەوە |
| ↑ | ↓ |
| ئاوڕدانەوە | دووپاتکردنەوە |

## ٤٧. پاشگری «دار»

پاشگری دار بە تەواوی لە کوردیدا جێکەوتووە و گەلێک گرفتی بۆ چارەسەر کردووین. لە کوردیدا ناوی تایبەتی دارا هەیە و بە مانای ئەو کەسەیە کە خاوەن شتێکە. پاشگری دار لە کرداری «داشتن»ەوە وەرگیراوە بە مانای هەبوون کە گەرچی وا دەزانرێ تەنها لە فارسیدا هەیە بەڵام لێکدراوەکانی لە کوردیی کەلهورپیدا فراوانن، وەک ئەم نموونە فۆلکلۆریکانە: «جووتێ چاو دێری وەک پیاڵەی چینی» یان ناونیشانی گۆرانیی «خاڵ دێری». لە هەر دوو نموونەکەدا کرداری دێری هەمان «داری»ی فارسییە. لە کوردیدا، پێوەندیدار واتە ئەو شتەی پێوەندی هەیە بە شت یان بابەتێکی ترەوە؛ یان، دوکاندار ئەو کەسەیە کە دوکانێکی هەیە. ئەم نموونانە بە خستنەسەری «ی» یان «یتی» ناوێکی دیکە دروست دەکەن، وەک خاوەنداری یان خاوەندارێتی. نموونەکان بریتین لە:

سەرمایەدار، باڵدار، ماڵدار، ڕێزدار، نیشانەدار، خاوەندار، مەترسیدار، وەفادار، کێشەدار، ئاژەڵدار، ئاگادار، پرشنگدار، بەشدار، مەودادار، مۆڵەتدار، دوکاندار، چەکدار، مەترسیدار، خاڵدار، دیندار، قەرزدار، نازدار

## ٤٨. تەوس، توانج، تەنز، تیز، تەشەر، تارۆز

ئەو وشانەی سەرەوە سەرلەبەر کوردین و واتاکایشیان لێکدی نزیکن. لە ئاخاوتنی ڕۆژانەدا وەک یەک سەیر دەکرێن، بەڵام لە توێژینەوەی ئەدەبیدا لێکدی جیاوازن و هەر کامیان خاوەنی پێناسەی تایبەت بە خۆیەتی. بۆ نموونە، لەم فەرهەنگەی بەردەستدا تەوس بۆ irony دانراوە و ئاوەڵناوەکانیشی هەر بەو پێیە سازکراون:

irony تەوس

ironic تەوسن

ironical تەوساوی

## ٤٩. هاوواتای ئینگلیزیی «یەکێتیی بوون»

یەکێتیی بوون، وەک زاراوەیەکی فرەپاتی بواری عیرفان و سۆفیگەرییە لە هەندێ ڕێبازیی فیکریی ڕۆژئاواییشدا هاوشێوەکەی دەرکەوتووە، لە عەرەبیدا بە «وحدت وجود» بەکار ئەهێنرێ و کوردییەکەشی هەر بەو پێیە دروستکراوە. ئەم زاراوەیە لە زۆربەی نووسینەکان وەک هاوواتای pantheism دانراوە، کە وەک بیرۆکەیەکی کاریگەری فەلسەفەی کۆنی ڕۆژئاوا لە سەدەگەلی هەژدە و نۆزدەشدا ڕەنگی دایەوە. گەر بە وردی واتا و پێناسەی ئەم زاراوە لاتینییە لێکبدەینەوە، تێدەگەیین کە جیاوازیی بچووک بەڵام گرنگ هەیە لە نێوان ئەم زاراوەیە و هاوتا عەرەبییەکەیدا و ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی نێوان ڕوانگەی ئیسلامی و ڕوانگەی هەندێ ڕێبازی فەلسەفیی ڕۆژئاوایی سەبارەت بە چیەتی و پێناسەی خوا و ڕۆح و سروشت. هاوواتا دروستەکەی «وحدت وجود» و یەکێتیی بوون، بە سەرنجدان بە دەلالەتی ئەم زاراوەیە لە فەلسەفەی ئیسلامی و ڕۆژئاواییدا دەبێتە panentheism. ئەم زاراوەیەی دوایی جیاوازە لەوەی یەکەم و بە بەراورد لەگەڵی کەمتریش بەکار دەبرێ.

## ٥٠. ست و شت

مەسعوود محەممەد پێی وا بوو لە کوردیدا دوو پاشگری شت و ست ناوسازکەرن و ئەمەش لە زمانە کۆنە ئێرانییەکانەوە بە میرات بۆ کوردی ماوەتەوە. ئەو تەنانەت پێی وا بوو لە جیاتی پەروەردە پێویستە بوترێ پەروەرشت چونکە شت مۆرکی ڕەسەنی کوردییە و دەبێ بەکار بهێنرێ. ست لە زانست، بڕست و توانستدا بە باشی دەرکەوتووە و دەکرێ زیاتری بەکار بهێنین. شت لە فەرمایشت، گوزارشت، ئازمایشت، خۆرشت، بارشتدا دەرکەوتووە. لە کوردیی خوارووداا ئەم وشانەی خوارەوە بە کار دەبرێن کە هاوشێوەی ئەوانەی سەرەوەن: جمشت (بزووتنەوە)، کنشت (اصطکاک)، ئاڵشت (تغییرات). خاڵی جێگای سەرنج ئەوەیە لەبەر هۆکاری دەنگناسانە —کە دەنگی نێوان ش و ت تەنانەت لە بزرۆکەش بچووکترە — شت لە فارسی و لە هەندێ هاوتای کوردیدا بۆتە ش، وەک ئاسایش و خوایش.

# نووسین و سمینار
# لەسەر زاراوەسازی و شێوازی زانستی

**کتێب:**

*فـەرهـەنگی زاراوەی ئـەدەبی، ئینگلیزی-کوردی*. (٢٠٠٢). بە هـاوکـاریی محـەمـەد مەحموودی. سلێمانی: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

«فەرهەنگۆک» بۆ *دەربارەی دیالکتیکی رۆشـنگەری*. (٢٠٠٢). نووسـینی موراد فەرهادپوور. وەرگێڕان لە فارسییەوە بۆ کوردی. سلێمانی: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

*فەرهەنگی شـیکارانەی زاراوەی ئەدەبی، بەرگی یەکەم: پیتی ئەلف تا جیٚ*. (٢٠٠٤). بە هاوکاریی محەمەد مەحموودی. هەولێر: دەزگای ئاراس. (چاپی دووەم، سـەقز: ناوەندی بڵاوکردنەوەی گوتار، ١٣٩٤).

*گەڵاڵەی پارادایمی پەرەسەندنی کولتووری*. (٢٠٠٤). هەولێر: دەزگای ئاراس.

«پێشەکی» بۆ *سەودای وتووێژ، پێکەنین و ئازادی*. (٢٠٠٨) نووسینی میخاییل باختین و چەند نووسـەری تر، هەولێر: دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکوریانی. (چاپی دووەم، سەقز: ناوەندی بڵاوکردنەوەی گوتار، ١٣٩٢).

*فەرهەنگی زاراوەی رەخنە و تیۆریی ئەدەبی، ئینگلیزی-کوردی-فارسی*. (٢٠١٦). سنە: توێژینگەی کوردستانناسیی زانکۆی کوردستان،

**وتار:**

«لێکدانەوەی چەند زاراوەیەکی نویٚ لە رەخنەی ئەدەبیی هاوچەرخدا». (١٣٧٨). *ئاوێنە*، س. 5، ژ. 5، لل. 13- 10.

«پێویستیی دانانی لیژنەیەکی زانستی بۆ فێرکاریی زمانی کوردی لە ئێراندا». (١٣٨١). *زمانەوان*، س. 1، ژ. 1، لل. 42- 33.

«پێشەکییەک لەسەر زاراوەناسی و زاراوەسازی». (٢٠٠٣). *ئاینده*، س. 5، ژ. 44، لل. 13- 6.

«وەرگێڕانی چەمک و زاراوە رەخنەیی و تیۆرییەکان». (٢٠١٢). *رامان*، س. ١٧، ژ. 187، لل. 72- 67.

«وەرگێڕانی چەمک و زاراوە رەخنەیی و تیۆرییەکان». (٢٠١٣). *رامان*، س. ١٧، ژ. 188، لل. 81- 74.

«وەرگێڕانی چەمک و زاراوە رەخنەیی و تیۆرییەکان». (٢٠١٣). *رامان*، س. ١٧، ژ. 189، لل. 62- 59.

«وەرگێڕانی چەمک و زاراوە رەخنەیی و تیۆرییەکان». (٢٠١٣). *رامان*، س. 18، ژ. 197، لل. 80- 77.

«وەرگێڕانی چەمک و زاراوە رەخنەیی و تیۆرییەکان». (٢٠١٣). *رامان*، س. 18، ژ. 198، لل. 58- 54.

«وەرگێڕانی چەمک و زاراوە رەخنەیی و تیۆرییەکان». (٢٠١٣). *رامان*، س. 18، ژ. 199، لل.. 58- 55.

«وەرگێڕانی چەمک و زاراوە رەخنەیی و تیۆرییەکان». (٢٠١٤). *رامان*، س. 18، ژ. 201، لل. 79- 77.

«پێشەکییەک لەسەر زاراوەناسی و زاراوەسازی». (١٣٩٥). *بووژانەوە: تایبەتنامەی زمانی کوردی*. سەرنووسیار: ڕەزا شەجیعی و هاوکاران. سەقز: ناوەندی بڵاوکردنەوەی گوتار، لل. ٢٧- ١٥.

**سمینار:**

«زمانی زانستی، هاوکێشەی جوانیناسانەی هاوچەرخ و پەرەسەندنی فەرهەنگی»، هەولێر، بنکەی رۆشنبیریی کاوە، 2003/12/30.

«وەرگێڕانی کوردیی *ئەزموونی مودێرنیتە*-ی مارشاڵ بێرمەن بە قەڵەمی مەنسوور تەیفووری»، سەقز، ئەنجومەنی ئەدەبیی پەیڤ، 1384/9/13.

«وشەڕۆنان و هاوتاسازیی چەمک و زاراوە تیۆرییەکان لە زمانی کوردیدا»، سنە، ناوەندی توێژینەوەیی کوردستانناسیی زانکۆی کوردستان، 1393/2/28.

«زمان و وێژەی کوردی پاش ٦٠ ســـاڵ ژیانی ئاکادێمیک: پێویســـتیی گۆڕانکاریی پارادیگماتیک»، دووەمین کۆنفرانســـی هاوبەشـــی نێودەوڵەتیی توێژینەوەی زمان و وێژەی کوردی و فارسی (بووتیقا و زمانناسی)، سنە، زانکۆی کوردستان، ۱۳۹۸/۳/۱۹.

# سەرچاوەکان

## ١. فەرهەنگەکان


**English:**

Abrams, M. H. (1971). ***A Glossary of Literary Terms***. Third edition. New York: Rinehart.

Cuddon, J. A. (1979). ***A Dictionary of Literary Terms***. London: Penguin Books.

Fowler, Roger. (1973). ***A Dictionary of Modern Critical Terms***. London: Routledge.

Peck, John and Martin Coyle. (1993). ***Literary Terms and Criticism***. Second edition. London: Macmillan Press.

Raj, Gagan. (1992). ***Literary Terms***. New Delhi: Anmol Publications.

**French:**

Blau, Joyce. (1965). ***Dictionnaire Kurde-Francais-Anglais***. Bruxelles: Publ. du centre pour l'étude des problèmes du monde mulsuman contemporain.

### کوردی:


ئەحمەد ئەسوەد، نەوزاد. (٢٠١١). ***فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی و رەخنەیی.*** سلێمانی: بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی.

بابان، شێرکۆ. (٢٠١٠). **«چەپکێک لە زاراوەگەلی بواری ئەندازیاری»**. گۆڤاری *زمانناسی*. ژمارەی ٧، هەولێر: رێکخراوەی زمانناسی. لل: ١٧٠-١٥٨.

بەکر ولی، رزگار. (٢٠٠٩). **«زاراوەگەلی بواری وزە و گەرمی بزووتن»**. گۆڤاری *زمانناسی*. ژمارەی ٣، هەولێر: رێکخراوەی زمانناسی. لل: ١٧٥-١٦٣.

تاڵەبانی، نووری. (٢٠٠٦). ***فەرهەنگی قانوونی (عەرەبی-کوردی-فەرەنسی-ئینگلیزی)***. چاپی دووەم. سلێمانی: مەکتەبی بیر و هوشیاری.

تاهر شەریف، عەبدوسەتار. (١٩٨٥). ***قامووسی دەروونناسی.*** بەغداد: چاپخانەی عەلا.

حاجی مارف، ئەورەحمان. (2014). ***فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی (کوردی-عەرەبی-ئینگلیزی)***. چاپی دووەم. هەولێر: چاپخانەی ڕۆژهەڵات.

خدر، عوبێد. (٢٠٠٧). ***فەرهەنگی کۆمەڵناسی.*** هەولێر: ئەکادیمیای کوردی.

جەوشەنی، عەلی. (١٣٩٤). ***کوردستانیکا: فەرهەنگی ئینگلیسی-کوردی-فارسی.*** بانە: چاپەمەنی مانگ.

داوود، ئێلمیراد. ***وشەکانی نیشانە-واتاناسی.*** وەرگێڕانی مەسعوود بابایی. پەڕاوی پەپوولە: http://telegram.me/papulaikamall.

شەبانی ئەحمەد. (١٣٩٤). ***فەرهەنگی زانستی سیاسی***. چاپی دووەم. سنە: زانکۆی کوردستان.

شەریفی، فەرشید. (٢٠٠٧). ***فەرهەنگی زاراوەکانی فەلسەفە و زانستە کۆمەڵایەتییەکان (ئینگلیزی-فارسی-کوردی)***. سلێمانی، سەردەم.

عەبدول، جەمال. (1995). ***زیوار: دستە فەرهەنگێکی زانستی (ئینگلیزی، عەرەبی، کوردی)***. هەولێر: چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری.

عەبدلقادر شمقار، نژاد. (٢٠٠٣). ***فەرهەنگی ئابوری (ئینگلیزی، عەرەبی، کوردی)***. سلێمانی: دەزگای سەردەم.

عومەر محێدین، نەوازد (٢٠٠٥). ***فەرهەنگی بیرکاری***. سلێمانی: دەزگای سەردەم.

عەبدولقادر شمقار، نەژاد. (٢٠٠٣). ***فەرهەنگی ئابووری***. سلێمانی: سەردەم.

قەزاز شەفیق. (٢٠٠٠). ***فەرهەنگی شارەزوور (کوردی-ئینگلیسی)***. هەولێر: ئاراس.

قەزاز، شەفیق و هاوکاران. (٢٠١٢). ***فەرهەنگی زاراوەی کارگێڕی***. ئامادەکردنی لێژنەی فەرهەنگ لە ئەکادیمیای کوردی. هەولێر: ئەکادیمیای کوردی.

کاردۆ. (٢٠٠٦). *فەرهەنگی زاراوەی شانۆیی*. کەرکووک: ئاریخا.

لێژنەی زاراوە زانستییەکان .(١٩٧٦). ***زاراوە زانستییەکان (عەرەبی-کوردی-ئینگلیزی)***. بەغداد: کۆڕی زانیاری کورد.

مەردۆخ ڕۆحانی، محەمەد ماجد و هاوکاران. (١٣٩٧). ***فەرهەنگی زانستگای کوردستان: کوردی-کوردی-فارسی***. سنە: زانستگای کوردستان.

ناوخۆش، سەلام. (٢٠١٠). ***فەرهەنگی دوانەی ئۆکسفۆرد (کوردی-عەرەبی-ئینگلیزی)***. چاپی چوارەم. هەولێر.

**Kurdî:**

Barnas, Rojen. (1992). ***Termên Edebî***. *Nûdem*, j. 1. Stockholm.

Chyet, Michael L. (2003). ***Ferhenga Kurmancî-Inglîsî***. New Haven: Yale University Press.

Rizgar, Baran. (1993). ***Ferheng (Kurdish – English).*** London: Lithosphere Printing.

Ali Bedirxan, Celadet. (2009). ***Ferheng (Kurdî–Kurdî).*** Stembol: Avesta.

Guneyli, Hesen û Hevkarên Din. (2014). ***Ferhenga Zaravên Teknîkî***. Istanbul: TMMOP. T

**فارسی:**

آشوری، داریوش. (١٣٨٤). ***فرهنگ علوم انسانی***. ویراست دوم. تهران: نشر مرکز.

الهی‌پناه، نوشین. (١٣٧٩). ***فرهنگ اصطلاحات ادبی***. تهران: دانشیار.

بابایی، پرویز. (١٣٧٤). ***فرهنگ اصطلاحات فلسفه***. تهران: انتشارات نگاه.

حسینی، صالح. (١٣٧٥). ***واژنامه ادبی***. چاپ دوم. تهران: انتشارات نیلوفر.

---. (١٣٨٠). ***فرهنگ برابرهای ادبی***. تهران: نیلوفر.

داد، سیما. (۱۳۷۱). ***فرهنگ اصطلاحات ادبی***. تهران: انتشارات مروارید.

سخنور، جلال و سیما زمانی. (۱۳۸۱). ***فرهنگ اصطلاحات ادبی***. تهران: نشر اشتیاق.

سلیمانی، محسن. (۱۳۷۲). ***واژگان ادبیات داستانی***. تهران: انتشارات و آموزش انقلاب اسلامی.

شکاری، شیوا و وجیهه معصوم. (۱۳۸۹). ***فرهنگ واژگان علوم اجتماعی***. تهران: جامعه-شناسان.

صفوی، کوروش. (۱۳۸٤). ***فرهنگ توصیفی معنی‌شناسی***. تهران: فرهنگ معاصر.

مردوخ‌روحانی، محمدماجد و همکاران. (۱۳۹۲). ***فرهنگ دانشگاه کردستان: فارسی-کردی***. ویراست دوم. سنندج: دانشگاه کردستان.

مقدادی، بهرام. (۱۳۷۸). ***فرهنگ اصطلاحات نقد ادبی از افلاطون تا عصر حاضر***. تهران: انتشارات فکر روز.

مقدادی، بهرام. (۱۳۹۷). ***دانشنامه نظریه ادبی از افلاطون تا به امروز***. چاپ دوم. تهران: نشر چشمه.

مكاريك، ايرنا ريما. (1398). ***دانشنامه‌ی نظریه‌های ادبی معاصر***. ترجمه‌ی مهران مهاجر و محمد نبوي. چاپ ششم. تهران: آگه.

وقایع‌نگار، علی‌اکبر. (۱۳٦۹). ***بدایع‌اللغه: فرهنگ کردی-فارسی***. به کوشش محمدرئوف توکلی. تهران: انتشارات توکلی.

## ٢. لێکۆڵینەوەکان

**English:**

Abrams, M. H. et al. (1993). ***The Norton Anthology of English Literature***. Sixth edition. New York: W. W. Norton & Company.

Barton, Edwin J. and Glenda A. Hudson. (1997). ***A Contemporary Guide to Literary Terms***. New York: Houghton Mifflin Company.

Daiches, David. (1981). ***Critical Approaches to Literature***. Second edition. London: Longman.

Green, Keith and Jill Lebihan. (1997). ***Critical Theory and Practice: A Coursebook***. London: Routledge.

Guerin, Wilfred, et al. (1979). ***A Handbook of Critical Approaches to Literature***. New York: Harper and Row.

Hawthorn, Jeremy. (1992). ***Contemporary Literary Theory***. London: Edward Arnold.

Lodge, David. (1993). ***Modern Criticism and Theory***. Longman.

Newton, K. M. (1997). ***Twentieth-Century Literary Theory***. London: Macmillan Press.

Rice, Philip and Patricia Waugh. (1989). ***Modern Literary Theory***. London: Edwerd Arnold.

Tallack, Douglas. (1995). ***Critical Theory: A Reader***. New York: Harvester Wheatsheat.

Webster, Roger. (1993). ***Studying Literary Theory***. London: Edward Arnold.

Wolfreys, Jullian and Wiliam Baker. (1996). ***Literary Theories.*** London: Macmillan Press.

**کوردی:**

ئیگڵتن، تێری. (٢٠١٦). ***تیۆریی ئەدەبی.*** وەرگێڕانی عەتا قەرەداغی. سلێمانی: ئەندێشە.

بەرزنجی، عەلی تاهیر. (٢٠١٤). ***چەند توێژینەوەیەکی ڕەخنەیی.*** هەولێر: ئاکادیمیای کوردی

پارسا، سەید ئەحمەد. (١٣٩٧). ***ڕوونبێژی لە ئەدەبی کوردیدا.*** سنە: نالی.

---. (١٣٩٧). ***جوانکاری لە ئەدەبی کوردیدا بە شێوازێکی نوێ.*** سنە: نالی.

حوسێن، هیمداد. (٢٠١٠). ***دەروازەیەک بۆ ڕەخنەی ئەدەبی نوێی کوردی.*** چاپی دووەم، هەولێر: دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکوریانی.

حەسەن بەسیر، کامیل. (١٩٨٣). ***ڕەخنەسازی: مێژوو و پەیڕەوی کردن.*** بەرگی یەکەم، بەغدا: کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد.

---. (١٩٩٣). ***مێژووی ڕەخنەسازی.*** بەغدا: دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی.

حەسەنپوور، ئەمیر. (٢٠١٥). ***سەدەیێک خەبات لە پێناوی زمانی کوردیدا: تیۆری، سیاسەت و ئیدئۆلۆژی.*** سلێمانی: بنکەی ژین.

دیلانی، تیم. (١٣٩٤). ***تێئۆرییە کلاسیکەکانی کۆمەڵناسی: لێکۆڵینەوە و بەکارهێنان.*** وەرگێڕانی خالد شێخی. سەقز: بیریار.

سەجادی، عەلائەدین. (١٩٧٨). ***خۆشخوانی: گوزارەکاری. ڕەوانکاری. جوانکاری.*** بەغدا: چاپخانەی مەعاریف.

شوانی، رەفیق. (٢٠١٤). ***وشەسازی زمانی کوردی.*** چاپی دووەم، کەرکووک: چاپخانەی داودی.

عومەر عوسمان، شیلان. (٢٠٠٩). ***ئیدیۆم: چەشن و پێکهاتەی لە زمانی کوردیدا.*** سلێمانی: کوردۆلۆجی.

فتووحی، ڕەحیم. (١٣٩٤). ***ڕێباز و شێوازەکان لە وێژەی کورددا.*** شنۆ: چاپەمەنیی ئاریا.

قارەمانی، جەعفەر. (١٣٩٦). ***زانستی ڕەوانبێژیی ئەدەبی، بەشی یەکەم: جوانکاری.*** سنە: زانکۆی کوردستان.

---. (١٣٩٧). ***زانستی ڕەوانبێژیی ئەدەبی، بەشی دووەم: ڕوونبێژی.*** سنە: زانکۆی کوردستان.

گەردی، عەزیز. (٢٠١٤). ***کێشناسیی کوردی.*** چاپی یەکەم، هەولێر: نارین.

لطیف شارەزووری، یادگار. (٢٠١٢). ***تیۆرەکانی وەرگرتن: لە ئیستاتیکای وەرگرتنەوە بۆ ڕەخنەی هاتنە وەڵامی خوێنەر.*** سلێمانی: چاپخانەی حەمدی.

مستەفا، شکوور. (٢٠٠٢) «ئەکادێمیا، فەرهەنگستان، زاراوەڕۆنان: کۆری زانیاری کورد، کۆڕی زانیاری کوردستان»، *گۆڤاری ئەکادیمی*، س. ١، ژ. ١، ٢٠٠٢، ١١٣-١٣٤.

محەمەد، مەسعوود. (1988). *زاراوەسازیی پێوانە*. بەغداد. http://www.mamosta.net

مودەڕس، عەبدولکەریم. (١٩٩١). *بەدیع و عەرووزی نامی*. بەغدا: چاپخانەی دار الجاحظ.

مەحوی. محەمەد. (٢٠٠٩). *زانستی هێما: هێما، واتا و واتالێکدانەوە*. سلێمانی: زانکۆی سلێمانی.

---. (٢٠١٠). *مۆرفۆلۆژی و بەیەکداچوونی پێکهاتەکان*. سلێمانی: زانکۆی سلێمانی.

---. (٢٠١١). *بنەماکانی سینتاکسی کوردی*. سلێمانی: زانکۆی سلێمانی.

مەحوی، محەمەد و ئەوانی تر. (٢٠١٠). *دروستەی کردار: بنەما و دیاردە*. سلێمانی: زانکۆی سلێمانی.

وێبستەر، رۆجەر. (٢٠١٧). *لێکۆڵینەوەی تیۆریی ئەدەبی*. وەرگێڕانی عەتا قەرەداغی. سلێمانی: ناوەندی توێژینەوەی ئەدەبیی عەبدولڕەحمان زەبیحی.

**Kurdî:**

Adak, Abdurrahman. (2015). ***Destpêka Edebiyata Kurdî ya Klasîk***. Çapa sêyem. Istanbul: Nûbihar.

---. (2019). ***Teseyên Nezmê***. Çapa yekem, Istanbul: Nûbihar.

Bolelli, N. & Ertekin, N (2017). "**Ferhengem Menzum di Edebiyata Kurdî de**." Bingol Universitesi Yasayan Diller Enstotusu Dergisi, s. 3, b. 3, j. 5, 2017, r. 21-44.

Seydo Aydogan, Ali. (2011). ***Rêzmanên Kurdî û Termînolojiya Wan ya Zimannasiyê***. Paris: INALCO.

**فارسی:**

احمدی، بابک. (۱۳۷۲). ***ساختار و تأویل متن***، 2 جلد. تهران: نشر مرکز.

السون، متیو اچ. و بی. آر. هرگنمان. (۱۳۸۹). ***مقدمه‌ای بر نظریه‌های یادگیری***. ترجمه علی‌اکبر سیف. ویراست هشتم. تهران: دوران.

امیرانتخابی، شهروند و همکاران. (۱۳۹٤). ***واژه‌نامه تخصصی مدیریت فرهنگی***. تهران: انتشارات علمی و فرهنگی.

بهار، محمدتقی (ملک‌الشعرا). (۱۳۸۵). ***سبک‌شناسی***. به کوشش سید ابوطالب میرعابدینی. چاپ دوم. تهران: انتشارات توس.

براهنی، رضا. (۱۳٤۸). ***قصه‌نویسی***. تهران: انتشارات اشرفی.

بنیامین، والتر و دیگران. (۱۳۹۸). ***زیبایی شناسی انتقادی: گزیده نوشته هایی در باب زیبایی شناسی از والتر بنیامین، هربرت مارکوزه و تئودور آدورنو***. ترجمه‌ی امید مهرگان. چاپ دوم. تهران: گام نو.

پوینده، محمد جعفر [گزیده و ترجمه]. (۱۳۷۷). ***درآمدی بر جامعه‌شناسی ادبیات***. تهران: انتشارات نقش جهان.

پین، مایکل. (۱۳۷۹). ***بارت، فوکو، آلتوسر***. ترجمه‌ی پیام یزدانجو. تهران: نشر مرکز.

---. (۱۳۸۰). ***لکان، دریدا، کریستو***. ترجمه‌ی پیام یزدانجو. تهران: نشر مرکز.

توسلی، غلام‌عباس. (۱۳۷۳). ***نظریه‌های جامعه‌شناسی***. تهران: سمت.

چامسکی، نوم. (۱۳۸۰). ***دانش زبان: ماهیت، منشأ و کاربرد آن.*** ترجمه‌ی علی درزی. تهران: نشر نی.

دیچز، دیوید. (۱۳۶۶). ***شیوه‌های نقد ادبی.*** ترجمه‌ی غلامحسین یوسفی و محمد تقی صدقیانی. تهران: انتشارات علمی.

سلدن، رامان. (۱۳۷۵). ***نظریه ادبی و نقد علمی.*** ترجمه‌ی جلال سخنور. تهران: فرزانگان پیشرو.

سیدحسینی، رضا. (۱۳۵۷). ***مکتبهای ادبی.*** چاپ ششم. تهران: کتاب زمان.

سیف، علی‌اکبر. (۱۳۹۰). ***روانشناسی پرورشی نوین: روانشناسی یادگیری و آموزش.*** ویراست ششم. تهران: نشر دوران.

شمیسا، سیروس. (۱۳۷۳). ***کلیات سبک‌شناسی.*** چاپ دوم. تهران: انتشارات فردوس.

فرای، نورترب. (۱۳۷۷). ***تحلیل نقد.*** ترجمه‌ی صالح حسینی. تهران: انتشارات نیلوفر.

---. (۱۳۷۹). ومزکل: ***کتاب مقدس و ادبیات.*** ترجمه‌ی صالح حسینی. تهران: انتشارات نیلوفر.

فرهادپور، مراد. (۱۳۷۸). ***عقل افسرده: نکاتی در باب تفکر مدرن.*** تهران: طرح نو.

فرهنگستان زبان و ادب فارسی (۱۳۸۸). *اصول و ضوابط واژه‌گزینی، همراه با شرح و توضیحات.* تهران: فرهنگستان زبان و ادب فارسی، گروه زبان‌ها و گویش‌های ایرانی.

---. (۱۳۹۸). *راهنمای گردآوری گویش‌ها برای گنجینه گویش‌های ایرانی.* تهران: فرهنگستان زبان و ادب فارسی، گروه زبان‌ها و گویش‌های ایرانی.

فورستر، ادوارد مورگان. (۱۳۵۷). ***جنبه‌های رمان.*** ترجمه‌ی ابراهیم یونسی. چاپ دوم. تهران: امیرکبیر.

قیس رازی، شمس‌الدین محمد. (۱۳۷۳). ***المعجم فی معاییر اشعارالعجم.*** به کوشش سیروس شمیسا. تهران: انتشارات فردوس.

کریمی، لطف‌الله. (۱۳۷۲). ***بررسی تطبیقی اصطلاحات ادبی.*** تهران: مجمع علمی و فرهنگی مجد.

گلاور، جان ای. و راجر اچ. برونینگ. (۱۳۸۵). ***روانشناسی تربیتی: اصول و کاربرد آن.*** ترجمه‌ی علی‌نقی فرازی. چاپ ششم. تهران: مرکز نشر دانشگاهی.

گوتک، جرالد ال. (۱۳۸۸). ***مکاتب فلسفی و آراء تربیتی.*** ترجمه‌ی محمدجعفر پاک-سرشت. چاپ نهم. تهران: سمت.

لچت، جان. (۱۳۷۸). ***پنجاه متفکر بزرگ معاصر.*** ترجمه‌ی محسن حکیمی. چاپ دوم. تهران: انتشارات خجسته.

لووتمان، لئو. (۱۳۸٦). ***رویکرد انتقادی در جامعه‌شناسی ادبیات.*** ترجمه‌ی محمدرضا شادرو. تهران: نشر نی.

منصور، محمد و پریرخ دادستان. (۱۳۹۰). ***روانشناسی ژنتیک 2: از روان‌تحلیلگری تا رفتارشناسی.*** چاپ هشتم. تهران: انتشارات رشد.

میرصادقی، جمال. (۱۳٦٦). ***ادبیات داستانی.*** تهران: انتشارات شفا.

نجفی، ابوالحسن. (۱۳۷٤). ***مبانی زبانشناسی.*** چاپ چهارم. تهران: انتشارات نیلوفر.

نیچه، فردریک و دیگران. (۱۳۷۷). ***هرمنوتیک مدرن***. ترجمه‌ی بابک احمدی و دیگران. تهران: نشر مرکز.

ولک، رنه و استین وارن. (۱۳۷۳). ***نظریه ادبیات***. ترجمه‌ی ضیاء موحد و پرویز مهاجر. تهران: انتشارات علمی و فرهنگی.

هریس، روی. (۱۳۸۱). ***زبان، سوسور و ویتگنشتاین***. ترجمه‌ی اسماعیل فقیه. تهران: نشر مرکز.

# A DICTIONARY OF CRITICAL TERMS

English-Kurdish (Central and Northern)-Persian

THIRD EDITION

D. Bakhtiar Sadjadi
Associate Professor of English Literature
Member of Kurdistan Studies Institute
Uinversity of Kurdisan, Sanandaj, Iran

**Wefayi House Publication**

**Erbil, 2022**

First edition, *A Dictionary of Literary Terms* (English-Central Kurdish), Suleimanieh: Serdem Publications, 2002 (co-authored Mohamad Mahmudi).
Second edition, *A Dictionary of Terms in Literary Criticism and Theory* (English-Central Kurdish-Persian), Sanandaj: UOK Kurdistan Studies Institute, 2016.
Third edition, *A Dictionary of Critical Terms* (English-Central and Northern Kurdish-Persian), Erbil: Wefayi House Publication, 2022.

# CONTENTS

